ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد - دهۆک
50

هزرڤان



هەلبەست

# ئازراندنا بەندەمانێ

* ئازراندنا بەندەمانێ
* هەلبەست
* هزرڤان
* بەرگ : عصام حەجی تاهر
* دەرهێنانا هونەری و کومپیوتەر: محەمەد عەلی
* تیراژ : ٧٥٠ دانە
چاپا ئێکێ / ٢٠٠٥
چاپخانا هاوار / دهوک
ژمارا سپاردنێ ( ٨١٤ )

ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسکارێن کورد/دهوک

کوردستان - ٢٠٠٥

# دیاری ...

بۆ/ وێ غوربەتا

ئەز د چاڤێن وێ دا مەست د بووم و

ڤیانا وەلاتی د من دا د ئاراند

هزرڤان

# ئازراندنا بەندەمانێ

وێ نازكا گەردەن ژ بەژنا پەیڤەكێ
زوو سلبوونا خوە راگەهاند، د چاڤێن وێ دا
ئاشتبوون ژ كەڤالێ هەیڤەكێ
تاریاتیێ هەمی كولانكێن فرۆشكەهێ كڤاشتبوون
من هزر دكر تەنێ لێڤێن تارێ د زوها و ڤەشاڤینە
ل بەر پێن تە سیڤاندا من ترسا ژ لێڤێن تە كری
لێ دلێ من نە ترس و رەشاتی لێ جهگیر دبن...
ڤیان ڤالاتیا گەردوونەكا مەزن دگریت، د چاڤێن من دا،
ل چاڤێن بەرامبەری دیوارێ هە و ل سپێدەیەكا نڤستی و كولانەكا پەچنی
پەچرۆم دكەن ب گۆتنێن رۆن/ وەلێ چاڤێن تە
ژ تیرهاڤێتنێ ساویر دبن
د بێنۆلیا هەلبەستڤانێ چاڤنەترس دا د گولاڤینە
تو؟ وێ گۆت: ب چو تشتا من ئاشت ناكەی
ژبلی هەلبەستەك پێخواس ل سەر پەرێن تەیرەك بلند...
تە؟ من گۆت: تەنێ من دكەی خەونەك درێژا ئەفسانەی
گەلەك ژ دوور سیمەرخ دفڕیت،

خەون ژ وێرێ دەست پێ دکەت
مرۆڤ ژ وێرێ حەزکرنا خوە همبێز دکەت
سیمەرخ دفڕیت، دبیتە جوانیەکا سەگلاوی و..
نێزیک دبیت، دبیتە ئۆتۆمبێلەکا کەڤنار
نێزیک دبیت، دبیتە فرۆکەکا خووندار
نێزیک دبیت، دبیتە گەمیەکا ئاسمانی و بهاڤێن گەردوونێ دبریت
نێزیک دبیت، د کۆلانکا گڤاشتی دا دبیتە «حاوا»
ئەزێ «ئادەم سەرژێر - بەرێژ، نۆکە وەرە ژ تەنشتا من دەرکەڤە
ئەڤ کۆلانا ئاشۆپا من د چاڤەکی تەدا دئاریت و مەست دبیت
نۆکە ئەز یێ ل بەر دەرگەهێ خەونەکا هنگڤینی
تەیا نازک ب پاسەپۆرتەک کۆماری دناڤ هەلبەستەک ئازری دا،
دبن هەناسێن سنۆران ڤە درامووسم ب ئەڤینی
ل پایتەختێ ئازراندنا دیتنێن من
تو د ناڤ نۆتێن سترانەکا مەست دا، دزڤڕی،
ل سەر دیوارێ نۆتەک بچووک من دخاپینی
یاریا دکەی ب گومانی، ب لێبۆکانی کەنیێ دکەی ژ کۆڤانێ
گریا ژ جەرگێ سترانێ د ئارینی
راست و راست تو ل سەر کەڤالێ مەزیکژەنێ چەرخی دروینی
چاڤ ژ نیڤەکا سەرێ من دەردکەڤن/دبن پەردەکا بنەفشۆکا
تو ڤێ پەردێ دهەردو مەمکێن خوە دئالینی
بەس کا بێژە! تو ئاشت دبی، یان دێ چاوانیا هەلبەستا من کەیە خوونی

١٩٩٦/٦/٢١ دهۆک

تو شووشەی و هەر تکەکا ڤ تە بکەڤیت دەنگەکێ هەی
هێڤکە دەستێن من یێن وەستیای
خێڤکە تریێ من یێ وەریای
تو پشیکی، چاڤێن تە برسی ژار دبن
گەر تو یا تێر یاریا دکەی ب گولۆلکەک هریا بادای
گەر ل سینگێ من بووی مێڤان هاریا دکەی، دڕندەیی
ئێڤاریەکێ ل گوهێن هەلبەستا من سوار دبی
خوە ب مێیەکێ ئاڤس دکەی
بەری زانێ هێکا تە دهێت، فرندەیی
پاش نیڤ شەڤا دەرگەهێ من دکەی باوەشینک
ب ژۆر دکەڤی... شووشە تبلێن من دبڕن
هندی دهێم تە نادەرکەڤی
تە و ئەلندێ چ دگەل ئێکە، قەی سوبەهی تو پالەیی

چاڤێن من یێن بووین قەشقەلانک، نەشێن دێمێ تە ب خوینن
لێڤێن من یێن بووینە شرکاک، دەنگا دوبارە دزڤرینن
نزانم تو چ تەبایی، ئارامیا من تێکددەیی
ئەز حەز دکەم بۆ چاخەکی
ئاشوویێن خوە ئەڤێن نەهێنە پەژارتن
ل بن پێلەکا هشیاریێ زیندان بکەم
هەڤالێن من چاڤەنێرن ل هەلبەستەکێ
ئەز باوەر دکەم «کێماتییەک یا ل دەڤێ شەیی»
وەرە دا پرچا من شەکەین ئەڤێ دارستانا هرچا
بهزرێن خوەیێن رۆدڕین هەمیێ ڤەکەین
هەیە تالان ژ وێدەرێ دەست پێ بکەت
چونکی هەر تشتێ ئالزی دڤێت ڤەکەین
هەتا ب ئەوێن ژ دایک نەبووین
د ئالۆزیا دا خۆڕ چاڤەنێڕین مرنێنە
ئەڤی دێوێ دناڤ کەسێ خوەدا بکوژین
تو بەس وەرە بەر دەرگەهی... دا ژۆرا من سار نەبیتێ
بەس چاڤێن خوە نیشا من بدە... دا دلێ من هەر نۆکە مرار نەبیتێ
ئەڤی دێوێ خەمساریێ دەنگێن خانی یێن گرتین
گەر دەستوورا هەوە هەبیت، ڤێ پێڤەبەستکا تەڕلانیێ دێ ژ خوە ڤەکەین
خانما من ئەوا من و وێ سۆز هەبوون، چو جار درەو ل من نەدکرن

پێویست نەبوو هەر تشتەکی من نەڤیابا
ئەز جارەکێ ژێرا بێژم دا ڤێ نەکەین
تو باوەر دکەی ئەز هەپارێ نەینکێ بووم
هەموو جارا دهاتە دەر بەس تە گزێ خوە ژ من دکر
کا دەستێ تە و پچەکێ ل تەنشتا من روینە
بلا دەرگەه ڤەکری بیت، چونکی هەیە ئەم ئێک و دو ل ڤێرێ بکوژین
یان کۆلێن خوە ب ئاشکرا هەمیا دەرکەین
ل چاخێ ئەز تە برامینم، توژی هەمی ببی ڤیان
ئەڤ خەونا هێشتا خوە کوشتن ژ خوە ڤەدەرکەین.

۱۹۹۷/۱۲/۱۸ مێرسیبۆرگ

من گەلەک حەز ژتە دکر
نۆکەژی حەزکرنا تە بەردەوامە
تو و جەگەرا من بتەنێ ئێک پارچەنە
(ئەرستۆ) هات هوون ژ ئێک و دو جودا نەبوون
(فروید) هات کەساتیا من بەرەف دوپشکا پارڤەکر
لێ دیسان ژی دناڤ پارچێن لەشێ مندا هوون پێکڤە بوون
بایێ نەرمە و ئەز مووییێن خوە ل بەر دتەزینم
هەتاڤ دگەهێن من دا نەمایە وان ل بەر ئاڤبدەن
لەورا بێ ئاوا شین دبن کولیلکێن مۆر
گەر من کولیلک نەڤیابان، د هزرا من دا شین نەدبوون
هەرچەندە ئەز گرێ خوە ژ بای دکەم
لێ ئەز و ئەو ژ مێژ وەرە ئێک ناسدکەین
هێشتا رۆیێن من فێرنەبووینە دگەل بگرنژن
دژوار دبیت، من سار دبیت
بەژنێن دارا سەمایێ دکەن
عەڤر هار دبن، تلیلیا ددەن، دار مەست دبن

لێ تیژە با دکانیکێن چاڤێن من دا بژۆر دکەڤیت
جارا گەرم دگەل رۆندکا ژ چاڤا دکەڤیت
تەزیاتیا رۆیێ من د هنگێڤیت و بەلاڤ دبیت
داکو رێک ل بەر هێرشان ڤەبیت
تەڤدا رەخ و بەرێن من دبێهنژن
وەک من بتەنێ ئەڤ دۆستانیا دگەل بای نێکەتیڤە
نۆکە ب کەری، ب تیژی، ب تەری
ل بەر پستۆیا من بژۆر دکەڤیت
هەر چەدە من روهنکر ژێرا ئەز کوولی مە
من گۆت: دەستێن خوە دبن گوهێن من را نەبە
ئەز نە فێربووینە ترانا، کەنیا من دهێت
نۆکە ئەز دێ بێهنژمەڤە
گەر بای یاری ب من نەکربان
گەر چەوتی ل گەردوونێ نەبان
پێویست نەدکر هندەک ڤایروسا ب هنێرن
دا ب گەهنە وەلاتێن دی
گەر پێویست نەبا من ساکوینێ خوە ڤەنەدکر
گەر نامۆیی نەبام هەستا من نە د ئاریا
من وەلاتەک گەرم دسەرێ خوەدا ئاڤا نەدکر
لێ دیسان ژی بریارێن راست ناهێنە دانێ ژ دودلی
چونکی نوکە کچا من خوهدایە و ژ مەمکی سل بوویە

دبێژن پانکا مەیا هاتیە سەرژێکرن
دناڤ گوهێن کاژا را، یێ متە بایێ گەلی
لڤێرێ ژی با بەلا خوە ژ من ڤەناکەت
نزانم بوویە (هۆلاکۆ) یانژی دفنا من کول بوویە
ژ نامۆیی بوونا ژۆرا خوە دەرەڤم
ب ناڤ گوهێن بایێ دووکێلی دکەڤم
د برووکا من دا ب تەنێ مارکەکێ هەی
دسەرێ من دا هزار وێنە یێن هۆزانێ
من ب تەنێ پارێ نانەکێ یێ هەی
چاڤێ من یێ ل گەلەک سالێن ژیانێ
جار جا جگارا دکێشم، مەیا من ڤەدخوار بەهایە...
دێکامێنتا ناگرم دا هزرا نەساخبوونێ نەکەم
سلاڤ ناکەم ژنێن بیانی
دا دوور نەکەڤم ژ هێزو شیانا ڤیانێ
دبێژن گەر با - د ناریت، کەس د ئەزمانێ وی ناگەهیت
لێ ئەز دشێم رۆمانەکێ ل سەر ئاڤاکەم
بەری من (مۆزارتی) سمفۆنییەک ژێ ئافراندبوو
(گوتێ) ڤاوست (خانی) بەر دناڤدا دیت
لێ من دڤێت هۆزانەکا دوور
ژ ڤایرۆسێن پەرسیڤی ژێ پەیداکەم
بەلێ خوونا (فارسی سەلمان) ژ بەلگێن گولا ڤەنەبوویە

ل بژوێتن شەڤا خۆزستانێ و گەرما بێداد
بۆ خواسە پێن برینەلۆ دبیتە نۆژدار
هەرچەندی ئەز بێزار دبم و با - ژی دژوار
نەکوشتنا (گالیلۆی) دبیتە خەون و نەژی باوەریا (حەلاجی)
نە کەڤلێ (مەزدکی) دبیتە نان و نەژی شاشکا (حەجاجی)
نەگەلەک بوو ئەڤ دەریا هۆسا بەلاڤە بووین
فرۆتنا جانی و برسی بوونا رەشا ل بیرا کەسەکی نەمایە
گەر من دەریا بەلاڤکربان دا لبا سوارکەم و دیوارا پێ ئاڤاکەم
من پەردە ژ ئۆزۆنێ چێنەدکر دا کون نەبیا
بلا دیوارێن مە شووشە بان
من کەس فێرنەدکر و کەسێ بەر تێوەرنەدکرن
بلا گول (سۆر نەبان (سەلمان) ژی نەدهاتە کوشتن
گەر هۆستای شوور چێنەکربان
دا شاشکا (حەجاجی) بیتە هێلینا چووچکا
نە (حەلاج) دبوو کافر و نە (گالیلۆ)ی درەو دکرن

١٩٩٨/٨/٢٥

# تەنهایی و ژڤان

ئەز یێ ل ژڤانێ و تویا ل ژڤانێ، داڤێن تەنهابوونێ ئەز یێ پێچایم
دناڤ ئاگرێ ژڤانان دا ژڤانا مە زڤستانەک پڕ درێژ بوو
نە هوڤەداڤێن تەنهابوونێ دهێنە بڕین و
نە ژڤانا پەلاتینکێن ئومێدێن مە ژبەر فڕین ب داوی هات
کۆڤانا مە لبن ئەسمانێ خوە کوشتنێ پشیکەکا پەنج درێژ بوو
هەر ئێڤاری دەرکەت دەرێ گۆت بوون: سپێدێ دێ ڤەگەڕیت
لێ سپێدە ما دناڤ چاڤێن تاریێ دا و
ئەلند د چاڤێن مەدا مرار بوو و چو جار نەهات
تو نەهاتی، مە ژڤان دابوو بەری کولیلک ب پشکڤن ئەم بگەهین ئێک
ل بەندەمانێ پێن من بوونە قورمێن دارا و

ئەز بوومە دیوارێ چینێ، ل دوور خەمێن خوە
تو نەهاتی و ڤیانا من درێکا تەدا نەڤەمریا ب ڕۆبارا و هەمی کینێ
مە سۆز دابوو، هێشتا سپێدە ژ دایک نەبووی
هەلامەتێ تاریێ راکەین، ل پشیکا خوە ببین خودان
مە سۆز دابوو تەڤ جیهانێ بکەینە مالەک
دا نەمینیت جهەک کۆلان
تو نەهاتی و ئەز ژی ژڤانێ بەرنادەم
نۆکە ئومێدا ژۆرا من بەس دەنگەکە ب چیتە گوها
من دیت زەردەشت ل شکەفتی بوو و دەنگ نەدا من
جزیری کەفت بوو خەلوێ و هۆزانا خوە شاندە با من
پاشی دەرگەه ل من گرتن، دا تەنهایی چێکەت روحا
ژۆرا من یا تەژی روح بووی، لێ دەنگە و
تەنهابوونێ خورِ پەرێن وێ یێن رەش کرین
پەیڤ نەماینە ددەستێن من دا خوە بسوژن
من جلکێن وان یێن ژبەر کرین
ل بن رامانا پەیڤ دگرن گەلەک خوها
سار و گەرم دبن - ب پەرسیڤن،
ب پژینە، دەرهۆچکێن خوە د ئالیسن
ئەز هزر دکەم فەرهنگا من یا لاواز بووی
جارا ژۆرا من دشنگریت

خورپ پەیامبەر ل سەر دەفتەرا من درووسن
تو نەهاتی و نە بەندەمان ب داوی دهێت و
نە ژبەر سینگێ من لا دچیت ئەڤ هەلامەت
ئەز و خەو پێن بووینە دژمن، هەکو جارا من داگیر دکەت
گەر ژ خەو رابووم قۆقلکێن چاڤێن من پیسن
هێش ئێڤارە و ئەز ژڤانێ ژبیر ناکەم
شەڤ درێژە و دناڤ درێشێن بێدەنگیێ را دەست پێدکەت
ئەز نزانم ل ڤێ شەڤبێریێ و تەنهابوونێ
دوبارە کەم تەڤ وێنەیێن هاتنێ و چوونێ
ئەڤ ژیانە نانەکا هشکا وەریایە
گەلەک چەتنە خورڤەکرنا ڤان چەنیکا
ئەز باوەر دکەم جارەکا دی دێ دەست پێکەم
ب چیروکێن زارۆکینیێ و مامک و یاریێن جۆنیکا
ل بیرا من بوو هەر ئێڤاری
ئەز بێژمە تە گەرەک بوو ئەم ژڤانا بدەینە ئێک
هێشتا پشیکا مە نە دەرکەفتی کۆلانی
تا داخوازکەم مێڤانداریا دارستانێ
هەکو هەڤر ژ ئاڤێ دزێن
هەکو دلۆپێن ئاڤێ دهێن
هەکو با - دهێت، هەکو پێلێن هەتاڤێ دهێن

دار دگەل ئێک و دو د ئاخڤن
دیلانێ دکەن، بەرەف ئێک و دو دلڤن
د بەلگێن خوەدا پەیدا دکەن چەکێ مانێ
کو گیاندار ل خوارنێ دگەرن
دزانن چەوا ژەهرێ دکوژن
لێ گول ژبۆ ئاڤسبوونێ خوە جوان دکەن
شرین دبن ژبۆ هەنگ و پەلاتینکا
نەبێدادە چو جار دادا دارستانێ
لێ پشیکا مە، مە هیکربوو نانێ دەستی
فێرنەبوویە بژیت ب تەنها، ب سەربەستی
بەلێ مرۆڤ پڕ بێدادە کو ڤالا دبیت ژ ڤیانێ
بەری ئەم ژڤانێ بدەینە ئێک و دو
ل بیرا من بوو ئەز بۆتە سترانەکێ بێژم و
من حەز دکر تۆژی ل من ڤەگێڕی
بەلێ دەنگێ من یێ زڤرە و کێرێن پێڤە
دترسم تو حەزێن خوە ژێ ڤەگێری
دەرەجا مە نەشۆشەیە و
ب شەڤێ توتیک ل سەر نانڤن
ل بیرا من بوو، ئەز تە ژبیرا خوە نەبم و
چو ژڤانێن دی بۆ یارا خوە نەکەم ستۆڤانک

من حەزدکر تو حەزێن خوە پچەک هیکەیە دەنگێ من
دا هەستێن تە ئەوێن نازک بکەم ب خێری
ئاگرێ خوە تێڤە هەلکەم و...
رانکێن تەنهابوونێ و حەزا ل سەر ببڕێرم و
ئەز ڤێ جارێ تە ب کنفکێن بەندەمانێ نا گرێدەم
چونکی قوربانیەک بێ ژڤان تو دێ وێری
تو نەهاتی و رامانێن من پڕ مەزن بوون
مژلانکێن من ل سەر رۆیێ یارا من بوون
کولیلکێن مۆر رۆیێ وێ کربوونە باخچە
بەلێ خەون خوڕ تشتەکی سەروبن دکەن
ل من بەرزە دکەن، ژبیرا من دبن ئەو تشتێ من دڤیا ژبیر بکەم
ئەڤ هەمی خەم ژ کیڤە هاتن
بۆ دیوارەک ل سەر مژیلانکێن من دانان؟
چ تشتەکی ژ خەوێ گرانتر هەیە؟
من گەلەک مرۆڤ دیتن ئەو هەمی ژ کۆڤە هاتن؟
بەرویکێن من کونبوون و ژێ دەر هاتن
ژ دفنێن من، ژ چاڤێن من، ژ گوهێن من
ژ ئەنیشکێن من، ژ چۆکێن من، ژبن ئەینۆکێن پێێن من
دهاتنە دەر، دهاتنە دەر، دهاتنە دەر، وەک تاژیان دبەردانە من
ئەز وەک خەزالەک ژ مرنا خوە ب رەڤیت، ژوان دوور دکەتم

هندەک کولیلکێن ل سەر رۆیێ یارا خوە
و هیڤییێن ناڤ پرچا نارامیێ من دگەل خوە بربوون
بێهن ژێ دهات، جوانی درەڤی، جوانیددا و بێهن ژێ درەڤی
لێ مژا خەونا من کەت، کلیلا خەونا من شکەست
گەلۆ دیوارێ ل سەر مژیلانکێن من چ لێهات؟
بۆچی مژیلانکێن من وەریان؟
رۆیێ یارا من ژی خالێن خوە هنداکرن
ئەرێ دایکا من هێشتا پیرە و یان ژی هێشتا پیرتربوویە؟
کچا من هێشتا بچووک و یان ژی نۆکە مەزن بوویە؟
هەڤالێن من هێشتا دگەل من ب بیرەوەرن؟
ئەڤان پرسا دێ هێلم بۆ بەرسڤەکا دی
نۆکە هەلبەستێ ناڤ و نیشانەک نووتر ژ من خوەست

١٠/٥/١٩٩٨ ئەلمانیا - لوبیێک

هەتا زیندان هەبن دیوار د هەرمینە و سنۆر ژ بێ رووەمەتیا خوە ناکەڤن
هەتا نفشێ مرۆڤی نەهێتە ڤاڤارتن،
هەتا سەرما و گەرم هەبن دیوار ژ پیرۆزیا خوە نادەرکەڤن
هێشتا جەنگێ ل بەر دەرازینکا مالا وە دەست پێ نەکربوو
لێ گەلەک نەما بوو دیوارێ ئارامێ بهێتە هەرفاندن
هێشتا تو نەهات بوویە رۆناهیێ
ئەوێ پیرەژنا فالک ڤەگر، ناڤەکێ رۆهن و مزگینیەک دابوونە دەیکا تە
بابێ تەژی خەونەک دیت بوو
بەلێ کەس ژوان نەدوێریا بۆ یێ دی بێژیت
نەکو خەون و مۆری بهێن خاپاندن
گوندێ وە ل ناڤبەرا دو چیان بوو
د هەردو بەرووکێن وی دا هەبوون دو گەلی
دناڤ کورکێ وی یێ بەفرین دا هێلینێن چووچکان د ساربوون
مشە سەرهاتیێن ترسێ هەبوون، گوندی ل هیڤی یا تە بوون،
ل بەندا هاتنا تە بوون، ب ژڤانا خوەشیێن پاربوون
دناڤ تەنگبوونا ئێڤاریەکا ئەفسانەیی دا،

د حەفکا چیایی دا رۆژ د خەندقی
دەرویشەک و سیبەر پێکڤە دناڤ هزرەکا ئالزی را
دناڤ ستری زەرکێن مێرگێ را، ل نیڤا گوندی دهەڤ دو ئالیان
سەر سۆرمانی گوندی گرتن
هندەکا چاڤ و دیوارێن خوە پەچنین، هندەکا دەرگەهـ پێڤەدان
دبێ دەنگ بوونا ترسا ئاسمانی وەرپێچان
پیرە مەلایێ گوندی، خوە هاڤێتە بەختێ دارێ و زووکا بانگ دا
ئەوێ ستێرناس، چوو سەر ئەینوکێن دیرکەهێ و بانگ هەلدێرا
١- ئەوێ خەمگیر دێ پەیدا بیت
٢- ئەڤێ دەرویش ژ ئەسمانی هات
٣- ب تەنێ مالەک ل هیڤیا وی یە
٤- کەس دەرگەهێن خوە نەگریت
٥- هەتا دنیا دبیتە تاری دێ ئارامی گوندی گریت.
هەرگاڤ ب گاڤ سیبەر بۆ ناڤ گوندی دوەریا و
مێڤان ب پیرۆزی و هندەک ترسێ، ل هەمی مالا
و ل هەمی کوولانان دگەڕیا
ل دەرێ مالا وە چۆک دانا سەر بەرەکی
گۆت: ڤێ مالێ دێ چیرۆکەک ژێرا هەبیت.
داپیرا تە دەست و ملێن وی ماچ دکرن
- مامێ دەرویش گەلەک دوعا ژ بۆمە بکە، دا دەرگەهێ خێرێ ڤەبیت.
ل مالا وە ژنکەک ب تەنێ یا نەخوەش بوو

ل مالا وه ژنکەک ب تەنێ یا بێ هۆش بوو
ل گوندێ وه مالەک ب تەنێ یا ئالۆز بوو
ئەو مێڤانێ ژ تیرۆژکێت رۆژێ وەریایی
دهات چاڤەنێرکرن خزل، کەت و ماتێن گوندییان دو دل
لێ هەمییان دزانی یێ پیروز بوو
ئەوێ شەڤێ هەمی رەشاتیا تاریێ
ئارام... ئارام دهات باسکرن
ب تەنێ ڤیژییێن ژنکەکێ گلیزانکێن وێ ڤەدکرن
جاران دوعاییێن دەرویشەکی دیوارێن بێ دەنگیێ دبڕین
پاشی بلند دبوو گریا زارۆکەکی، هەمی سۆز بوو
تو ژ دایک بووی، سڤیانەکەکێ دبەر سیڤاندا مالا وەرا دزویرکاند
بێ ئارامی ژ مالەکێ فری، فانۆسەکێ نەهێنیا شەڤێ درکاند
تە تیر دانابا تاریێ تشتەکی کێم ژێ نە دبری
تو ژ دایک بووی، دناڤ خوونێ دا دناڤکێ رای سەرژێکری
چەوا لێڤێن تە تەرکرن و تو بشکوری
ئێدی رۆژ بوو، تو هاتی و سەفەرەکا خوونێ بوو
تو هاتی و دناڤ خوونێ دای مەلەڤان بووی
تو هاتی و دەستپێکا جەنگەکا خوونەلۆ
رۆژەکا گەرما ئەیلولێ شۆڕەشێ دەستپێکر و
بابێ تە ژبەرووکێن شەری بریندار زڤری.
سال هاتن و سال دبوورین، کەنی دهاتە ڤەشارتن

ئارامی هات بوو سەرژێکرن
داپیرا تە ب شەڤان تو دبری و ب رۆژان ل بەرچاڤان بەرزەدکری
ئەسمانێ وەکوهارکێن سۆر دکوهی بوون
د شکەفتەکا ئارامێ دا، چیرۆکان بهاڤێ تارێ دبری.
زکێ چیای ببوو هێلینا خەونێن تە
ژ ترسێ پێڤە تو مێڤانێ شکەفتا ستوین بووی
تو هنداهوویێ ئەفسانەیا شەڤا دین بووی
دیوارێ مالا وە چیا بوو، بانێ مالا وە گیا بوو
تو ژ دایک بووی، پێشمەرگەژی نوو ژ دایک ببوو
تو هاپت بووی ئۆ شۆرەشەک پەیدا ببوو
تو هێشتا فەرهنگەک بچووک بووی
جیهانەک تەژی پسیار د مێشکێ تەدا
تە نەدزانی ترس چی یە و کەسەکی ژی بەرسڤا تە نەددا
تە نەدزانی برس چی یە و پرتێن نانی گەرتی دبوون د توورەکێ تەدا
هەر تشتەکی تو پێویست ببای، تە بگریێ داخواز دکر
نەییکرن ببوو کراس دبەرتەدا
تە هزردکر ئەو فرۆکێن بۆمبا دهاڤێن نە یێن خودێ باڤێ تەنە
ژ نک خودایێن دوژمن ڤە دهێن
تە رۆژەکێ پسیارەک کر: ما خودێ مە بۆمبە نینن؟
ئەڤ پسیارە بۆتە بۆ ترس، چونکی پیرێ شەقەک ل تەدا
وە گوندەک هەبوو گەلەک جوان

ل سەر نەینووکێن گەلیەکی هات بوو نژنین
خوە لناڤ گوهێن دو چیایێن بلند داہوو هلاویستن
تە هند دزانی هەر مرۆڤەکی دهێتە ڤی گوندی خوەشەویستن
سپێدەیەکا پاییزی بوو، بەلگ دگەل دەنگێ نالینا دوەریان و
دگەل بایێ ناپالم و بۆمبێن فسفوری سەمادکرن
دگۆتن: مامێ تە ژسەر کانیا نڤێژا زوو زڤڕی.
تە ژی ئێدی ئەڤ تشتێن هۆسا دبهیستن
گۆتن: هەر ل تاریێ گوندی بەردەن.
هێشتا رۆژێ چادرا خوە لسەر نەڤەدای، هێشتا ئەسمان نەدەگری
گۆت. نەخەونە بەلێ من دیت کانیا مە سل بوو ژ جۆکێ
ب هشیاری من گوهلێ بوو د خواند تۆکێ.
ئەڤ گوتنە گەلەک زووکا بەلاڤەبوو
هەر ل تاریێ گوندی لکولک و نهالان بوون
داپیرێ ئەم رەڤاندبووینە خەلۆکێ
رۆژێ داڤێن خوە ڤەدان و ئەسمان ئاریا
هەفت فرۆکە، هەفت جا مرن هات ئەڤرۆکە
هەڤدە ناپالما گوندێ مە دووریێچکرن
چار ب تەنێ بوونە بەهرا شکەفتۆکێ
ل سەرێ سپیکێ بزن و بێری پێڤە کوشتن
گەلەک ئێڤارەک درەنگ بوو، داپیرێ گۆت.
ئەڤە ژ سپێدێ تەڤ ژنوو مێرێن شارەزا گوشتی کۆمدکەن

بەلێ هێشتا نەدیارن گەلەک پارچێن مەیرەمۆکی.
تە نەدزانی چیرۆکا ڤێ رەڤوورویتیێ
ئەفسانەبوو ئەڤ هەمی رابوون و کەفتن
تە نەدزانی بۆچی ب شەڤێ مالا هەوە..
ل ناڤ داروبەرایەو ب رۆژێ شکەفتێ
شکەفتا بستوین و شکەفتا رەش و ناوسکا لپشتا دیرگەهێ
هەر ئێکێ ژوان ئەفسانەکا تایبەت هەبوو
ئەوا هەنێ! تەنێ جهێ پیرهەڤیان بوو وە داگیرکر
ئەوا دیتر گورگ و هرچا ژبەر وە بەردا و
چوونە سەر بەختێ پەرێسگەهێ
تو مەزن دبووی و شۆرەش هەر مەزن دبوو
پسیارێن تە بەرسڤێن وان دهاتن دان و
فەرهنگا تە وەک دەریایێ بێ بن دبوو.
رۆژەکێ گۆتن نەڤرۆزە و دێ ئاگرێ جەژنێ هەلکەن
تە نەدزانی کو ئاگرێن جەژنێ چنە
کەسک و سۆرێ وێ ئێڤارێ گەلەک بترس بوو
داپیرێ گۆت: ئەڤ کەسکەسۆر نیشانە بۆ خودایێ مەزن
هەر کەسەکی دسەر را بچیت دێ چیت و چیت
هەر کەسەکی دبن را بچیت دێ چیت و چیت
ئەگەر ژن بیت دێ بیتە مێر، ئەگەر مێر بیت دێ بیتە ژن.
پاشی پیرێ کورتە سترانەکا هەرجارا مرادا

دگەل گولۆلکا خوەیا هریێ ب تەشیێ بادا
ژلایەکی گولۆلکا وێ پشیکێ بۆ خوە درەڤاند
ژلایەکی ئەز دبەزیمێ، خورێ بەنکێ وێ ئالزی بوو دناڤ دەستادا
من چاڤ لێ بوو هیڤیەکا جوان و گرنژین
ل سەر رۆیێ وێ دچوونە چۆلێ قوڕادا
من ژ کەنیا دیمێ وێ دخواند
- دێ ڤرالێ سڕسەقەمێ بیتە بەنی
ئەڤ ژهێن من، ئەوێن سڕێ بێزارکرین
دێ ڤەژین و خورت بنەڤە ژ گەرمادا.
((هاتی نەڤرۆز - نەڤرۆز ڕ نەڤرۆز
بەهارەکا کولیلکێن خەمر و سۆر و زەر
ئێدی ئەگەر کاروانی بچن هەر ڕێکەکێ و
پێشمەرگە ل سەرێن چیا نابن ئالۆز))
(ئەناهیتا) ژ ئەسمانا دهێتە خوارێ
(گولبارین) ژ خەوێ رادبیت، دا بکەنیت دگەل بەهارێ
(توماتین) هەفت داڤێن دەزی و هەفت دەرزیا
بۆ وان دهاڤێژیتە پشت کوارێ
دێ بۆخچە هێتە ڤەکرن و
هەتا سپێدێ درەفشا کاوەی دنەخشینن
ئەوێ شەڤێ وەکی هریا داپیرا خوە تویێ نەرم بووی
تو ڕێڤینگێ قوناغەکا ژیارەک نوو بووی

تە هزر دکر ئەگەر دیوارێ کەلا دمدم بهەڕفینن
دێ تبلێن تە هەرشینن
(فەرخ و ستیا) بۆ وەک کەسک کرنە دیاری
مزگینییا بەهارێ بوو
(سیابەند و خەجێ) هاتن سۆر دانە وە
مزگینیا خوونا ئەزژەهایی و شکەستنا زۆرداری بوو
(مەم و زینا) دەستمالەکا سپی هاڤێتن سەر چۆکێن تە
چەڤەنگێ ئاشتی یا ڤی واری بوو
پاشی (خانی) ب خوە هات و رۆژەکا زەر دا دەستێ تە
- گەر ئەڤ رەنگنە بکەهن ئێک سال ببەرە
ئەڤ ئالایێ وە کوردا و بۆ ئەلندا وە خاوەرە
سلاڤێن مە ل کاوەی بکەن، گەر زۆرداری خوە دشکێنن
ئێکی دی ل شوونێ نەچینن
(فەرهادی) چیا دبڕین و دیاریا خوە
بهەمی رەنجا دگەهاندە کۆچکا شرینێ
میرزای ژ پشت دەریا، سیڤا نەمرنێ دئینا و
هەر ئێکی ئاگر هەلکری ژ سیڤێ خوار
داکو رەڤشتا ئاگرکرن، ل ڤی وەلاتی بکەهیتە تەختێ ژینێ
- ئەوێ رۆژێ ل گوندێ مە تشتەک سەیر و سەمەر گوتن
گوندی یا دگۆت. هۆیا -- هۆیا..
هێشتا رۆژ بوو خانییێ مە نەدترسیا ژ دلۆپا

زەلامەک چوو سەر بانەکی و کرە گازی:
چی دارێن ماین بکەنە سۆپا و
هەر مال و ئێک وەرنە دەرێ و بزوتێن ئاگری راکەن
هندەک ل دەهمەنێن چیا و..
هندەک ل ناڤتەنگێن چیا و..
ئەوێن چەلەنگ هەلباسکبنە سەرێن کۆپا
دێ زڤستانێ کەینە دەرێ وپاشی ئێک و ئاگر هەلکەن
- ژڤاندان و ئۆ ژڤانێ درێژ نەکر
کومێرۆیەک ژ گوندی دەرکەت
چەندی دنیا تاری دبوو
چیایێ مە چاڤێن وی دهاتن ڤەکرن
هزاران چاڤ دگەل ئاڤابوونا رۆژێ
ل چیای گەشبوون وەکی گلۆپا.
هەفت کچکێن جوان بڕیار دان خەونا نەبینن
ل ئەڤێ شەڤێ نڤستن گونەهە
هەر زارۆکێ بیست لێ بکەڤیت
هەلگرتنا بۆخچکا گرتی بۆ وی دکەڤیت
دێ لهەسپەکی کومێت سوارکەن
دێ ل کۆلانێن گوندی گێڕن، گەر نەکەڤیت
لدەرێ ژۆرا هەر هەفت کچکا دێ پەیاکەن و
پەیکەرێ ژ بەفرێ چێکری هەلوەشینن

هەر هەفت کچک دێ هێن رۆیێ وی ماچیکەن و
دگەل بۆخچەیێ بنە ژۆرڤە و
لسەر جهەکی نەرم دانن
ئەڤە قوربانێ دوهی بوو و
ئەڤە سەرداریێ سوبەیە، نائێشیێن
هۆسا جەژنا وە بداوی دهات
هێشتا تاری ل ناڤ مژیلانکێن گوندی بوو، وە گوند بەردا
چیا ئەڤرۆ پانەگەهە ژ بووی مەردا
رۆژ دبورین و بەهارێن مە هەر جوان دبوون
تو مەزن دبووی، تو وی چاخی هندی من بووی
ل دووف دەنگ و باسێن ئێزگەهی
شەر ل بەرۆکێن بەرەڤانییێ گران دبوو
گولا سەرێ خوە هەلدان و پاشی مرن
دار و بارا بەرهەمێ خوە گەهاندن و
هەتاڤێ بان زوهاکرن، ل بێدەران زەربوون گەنم
تە هزر دکر نۆکە چاخێ تە هاتی یە
دگەل یارەکێ دەستان بگری و
دکت و ماتێن خەونێن تەدا د رازان خانم
شۆرەش کەت بوو قوناغەک دی دا
چار سال بوورین ل گوندێ وە هەر شاهی بوون
چار سۆلێن سۆرێن ئال بوورین

چار یار بوورین ل گوندێ وە ئاڤاهی بوون
تو ل وی چاخی سنێله بووی، تو ژ چیا هاتیە دەشتێ
تە رۆژێن بێ عەڤر دیتن، تە ئەردێن بێ کەڤر دیتن
تە پۆلیس و زەلامێن بێ سمبێل دیتن، تە بازێرێ تومبێل دیتن
ئەگەر هێشتا ل بیرا تە بیت، رۆژەکێ ل پەرێ گوندی
بۆ وێ کچکا هەڤالا خوە، تە زۆر پەسنێن بازێری دکرن
- خانیێن وان گەلەک دجوانن، ئاخ لێ نینە
گەلەک دکان ل نک ئێک هەنە،
چراییێن وان بشەڤێ دهەلن، گاز تێ نینە
تومبێلێن هەین، شەکرۆکێن هەین،
بووکێن لاستیکی دتەڕینە.
تە جارجارا سەرهاییێن ئەڤیندارا بۆ ڤەدگێران
تە ژڤان دابوو رۆژەکێ هوون بگەهن ئێک ل شاران.
لێ ئەڤ ژڤانە راست نەهات، جارەکا دی شەر و کوشتارا دەستپێکر
جارەکا دی کۆچ و کۆچبارا دەستپێکر
جارەکا دی تۆپ و تەیارا دەستپێکر
تو وێ رۆژێ ل بەر پەزی بووی
تو وێ رۆژێ گومتلەک بەفرا تەزی بووی
تو وێ رۆژێ دەفتەرەکا بێگونەهـ و خانییەک تەژی خوەزی بووی
جەنگە و هێشتا خونا گەرمە، جەنگە و پێشمەرگە ل چیایە
جەنگە و (عیسێ سۆر) دگەلی دا، جەنگە و دیسان هۆڤیتیا دوژمنایە

ئەوێ سالێ دارێن هەوە بخودان کەتن
کەڤرێن چیایێ وە ئاڤس بوون و مرۆڤ ژ زکێ وان دەرکەتن
گەلەک جارا ئێزگەی ئاڤێ شەهیدا دگۆت و پتر جارا
مزگینی دهاتن سەرکەتن
بەهارەک زوو دارا تووڤیا وە وەشیا ، خەبەرێن پڕ نەخوش هاتن
گۆتن شۆڕەش هەلوەشیا ، ئێدی وەلات هەمی بوو گری
تە دیتێ مرۆڤێن سەر بڕی
ئەزمانێن وان د حەفکێن واندا بەرزە ببوون
ل کۆچکا وە زەلام ڕێزڕێز روونشت بوون
گوند ژ مرۆڤان حەشیا ، ئێدی گری نە شەرم بوو
ڕۆندک ببوون دلۆڤانی و پەردەکا بێ دلۆڤانیێ بسەر گوندێ وەدا کشیا
برایێ تە (ئەیۆب) هات و تەڤ شیانا وی یا فڕی
ئەزمانێن پیرەمێرا مووی لێ شین بوون دڕک و ستری
-: ڤێ جارێ ژی خەنجەرەک ڤ پشتا مەکەت.
ژیێ تەیێ چاردە سالی نەگەهشت بوو
لێ بەلکی هێش تو زارۆک بووی
تە نە دزانی چییە شۆڕەش هەلوەشیان و
بۆچی ل شەڤێ پەلاتینک دهێنە ئاگری

١٩٩٧ ئەلمانیا ، لوبێک

# تشتەک ژ ڤەگەڕیانێ

- تو تەیرەک بووی، د خەریبیا من دا فڕی بووی
سپێدە بوو و هەتاڤا کزبوو ل توخێن عەڤری
هەر دیسانێ کراسێ مۆنیکایێ، ژ خەونا من یا ئێڤاران پڕ کوورتر بوو و
وانەیا مە ل سەر تەختەبەندا فێرگەهێ یا درێژە
مۆنیکا سێڤەکە و بتاکێن سپێدەیێن پەتخی ڤە
دەستێ ئادەمی ناگەهیتێ
حاوا ژ حەزکرنا یا بوویە بوم د سیبەرێ را
سینگێ وێ ژ بن بەلگا یێ ڤەدەرە
ژ سالەکا خرش و ژ ئێڤارەکا ترش بەرەف ڤێرێ مشەخت ببوو
من باوەری ب تشتێن دوور نەمایە
ئەگەر نۆکە دا ل کوژیەکێ پەرێسگەهێ زکرێ زەرکەم

پاشی دا وەکی سەنعانی ژ دیتنا سێڤێ
پەنجێن خوە کەمە تەڤنپیرک و پەراستنێ بەرامبەرکەم
- تو تەیرەکی و ئەز یێ ل سەر پەرێن رێکێ ئاوارە بوویم
ل چاخێ شەڤ بێ پەردەنە و نێرگز ب دیوارانڤە دهێن
ژیان دکەڤیت زەرکا هێکێ، ڤیانا تە پەراستنا مزگەفتێ یە و
جەندرمێن من پەلاتینکن
تو گوهلێرویەک بنەفشی بووی، ئەز پاشمەرگێ ئەڤینەکا ئێک لایەنی
خەمێن من هندە با - دێ بت
ئەز حەزناکەم تو گولەکا بێ ستری بی
گەلەک لدوور بەهار ژی ژ مێژە یا پیربووی
توژی چاخێ گیا زەر دبیت خورٍ وەریا بووی
ئاشوێیێن تە د هەلوەریای بوون
ل ناڤبەرا مرنا تەو کەڤیا بەفرێ کولیلکەکە
گەشن چاڤێن سۆسنێن وان
چیا... دیتنا مە دبزدینن
بهاڤ یێ ژ پیڤانێ کەفتی، هند یێ دوور بووی
وەک ئاگری چووچک دگەل بای دفرن، کولیەک دناڤ دمێ وان دا،
هەستکرنێن من تەڤ د ئازرن، فلییەک دناڤ کومێ وان دا
بلەزن چووچک - شکەفتن دەڤێ تیژکێن وان
د پاریەک خوەش ببیت ژیانەک ڤەکری
د تەزن هەلبەست، رامانێن وان نەڤراز دمەشن
دا یاریەک خوەش ببیت ژیانەک نەمری.

- تو د شکەفتێن هەستا من دا نیندرتالی
وەکی مەستبوونا ئێکجاری
دا غەریبیێ دبن نەینۆکان ڤە ببڕی
گەر تە خەونەک بمن ڤە دیتبا و تە نە گوتبا،
تو دێ بەرەف مال ڤەگەڕی
جارا بەرێ ئەز فڕیبووم دگەل کەڤوشینکەک کووڤی
لێ ڤێ جارێ لهەسپەک ئاگری سواربووم
گەر نەژ تەبا ئەز نەدبوومە تەیرکێ شەڤێ
ئاشووپەک سۆر، شەڤەکا مۆر
دبەر زنارێ خەونێن تەرا ئەخنۆخ مابوو ل بەر تاڤێ
تو دلۆپەک بارانێ بووی ل ئاخلێڤێ
ئەز حەزکرنا هەستەک سێوی و کەرێ سێڤێ
ل ناڤ بەلگێن گول و پەرێن پەلاتینکا
ل سەر پشتا پەستەیەک ئاڤرمویشی
وەکی تابۆتەکا هاڤێتی ل سەر دەڤێ دەریای
ئەز نە گوندوورەک رزیە و تومکێ ماسییا
نە گەلوازەکی خەونێن مۆر و برێڤەچوونا لناڤ جەهداسییا
تە دگەل خوە دەرباز ناکەم ئەوی لای
یاریا بسیتاڤکا من نەکە،
یاری و سیتاڤک رۆیەکی دی یێ خەونایە
ئەڤرۆکە ئەگەر دوهی با - من نەدزانی
کا بۆچی سیتاڤک ژ من مەزنترە

تو رۆناهی و ئەز لناڤبەرا تە و دیواری
سیبەر زارڤەکەرێ منە
ئەو سترانا تە ل ناڤ مێرگا بیرهاتنا
بۆ زارڕۆکێن خوە کریە گول
و د چاڤێن تەدا بوویە کل - من یا ژ بەرە
دگەل بێهنا شەڤبوویا دناڤ باخێ مەدا دێ دەمە بای.
- ئەز تەیرەکم سپێدە زووا لباخچێن خویساری دگەرم
تو گولەکا مەست و خەونەکا بنەڤشی بووی
ببووی گلیلەک زڤستانێ بسیڤاندا ژۆرا من ڤە
تو ب هەلما من ڤە وەستیایی
تو ئاگرەک درەفشی بووی
دناڤ کەڤیا حەزێن من دا دلۆپ - دلۆپ
وەک بهاڤێن سەرما و سرێ حەلیایی.
- سپێدەیەکێ - هێشتا هەتاڤ نەگەهشتی و
گوندوورێ رۆژێ باڤزەر دبیت
هێدی وەرە د رێلستانا هزرێن من دا
بەلێ بترالێ نە رازە
ئەز ئێڤاران ل سەربانێ پەسارگەهێن گووڤەندا کەچ
کەژێ ئێدیۆلۆژیێن شکەستی دژەنم
چەک و تاکێن فێرمەسۆنی یێ تێکهەل باوەریا سوفی یا دکەم
ژ ناڤا تبلێن مێژۆیەکا نەڤەبەستی درەنم
کولیلکێن گەشبوویێن شەڤێ و بێهنا نیمۆیەکا گەهشتی یا پاییزان و

ئاشۆپەکا بەربەلاڤا ل چو نە بستی ل من داخوازە.
- ئەگەر تو دگەل من ل رێکێ بایی
ل هامبۆرگێ و بێلنتسۆنە، دا شووشەکا گولاڤێ بی
دا ل ڤەنێزیا ل پاپۆرەکا کەڤن سوار بین
دگەل حەزژێکرنا دۆلفینا و لەیزتنا پێلێن ئاڤێ
دناڤ لێمشتێن تاریێ دا خوە د دەمە بایی.
تو تەیرەکی و ئەز تەیرەکم
ل بەرامبەر مە رەفەک تەیرا ل تاریێ دنشن
دیوارێ وە و دیوارێ وان یێ ل سەر بەفرێ
وەرە دا ئەم ل سەر کەنارێ گوما شەڤێ
خانیکەکی راوەستیای ژ بەفرێ چێکەین
هەر تەنێ ناڤ خانیێ مە بیت
هەکو دبیتە زڤستان و سەرما دهێت کار ل مە ناکەت
گەر هاڤین هات مە پێکڤە سیبەرەک دڤێت
دا سیڤاندۆک د هێلینا دا ئارام بن، پەلاتینک نەهێنە وەستاندن
ئەو کولیێ ل سەر زەندێ من میڤانە
وان ژی وەک مە ب تەنێ فەنەرەک دڤێت
ئەگەر من گوتبا تە سوبەهـ، من چو یارێن ژ درەو نینن
ئەز پیرەموگانێ دویریێ مە
خەلوەت نشینا جزیری ب تەنێ دلبەرەک دڤێت

ل سەر دەریا ئیجە ١٩٩٩/٥/٧

# تو ئەو خەونا هەمی جارا من
# ڤەخواندی و رامانێن وێ راڤەنەبووین

سپینە کەڤۆکێن خەونێن من

هەمیشە تو بەهارا کەسک و گولشەنی

دوور کەتن و تەنهایی یا من ئاسوویەکا ئومێد مزە

ئەز خورێ شەڤا کەسکاتیا خوە ڤەدخوونم

رۆمانەکا حەزکرنێن من ئەوێن پیرۆز و نێرگزە

هەرچار دیوارێن مە مژن

لێ چاڤێن من تاریێ دکوژن

هەمی هەبوونا ڤێ گەردێ

د دەستێن من دا یا بووی گولۆمچکەک بەفرێ

لێ تو ب تەنێ ملیار گەردێن دی چێدکەی
فەرهنگەک پەیڤێن بیانی ل سەر سینگێ من
سێ چار لەرزکا د خەودا گرت هەڤالێ من
ئەڤ لەرزکێن وی ژبۆ سەرخوەش بوونا مشەختییێ بوونە مزە
یێ د خەوە هەڤالێ من
ببووین رامانەکا مەزن، ئەز و ئەو پەرێن خوەیێن سپی
گەر دبوو هەلم و ب تەنێ لەرزی قەلەمێ من
همبێزکرن سێ تبلێن من
نۆکە گەلەک ژ هەڤالێن مە دناڤ پێکێن خوەیێن مەست دا
دناڤ دووکێلا جگارا را یێن بووینە کۆمەکا دژا
بەندەک ب تەنێ دناڤ کیشوەرێن نامۆیی دا
بەندەک ب تەنێ دفریت، خەونەکا بێناڤ دخوونیت
هەڤژینا من تو وەرە دگەل من روینە خوار
دا ئەڤ شەڤە ب پاشبەندێن ئازراندنێ
ب هەڤدە سالێن ژینا خوەدا ب چینە خوار
هەستپێکرنا من سنۆرێ عەڤرا دبریت
هێدی دەستێ خوە ب لڤینە ل سەر رۆیێ من
تو بێژە من کا دەستێ تە ژ موویا دگریت
قومچەیێن سینگێ من ڤەکە، رێلستانا موویێن شپێرڤە
دلێ من یێ بوویە چووچکەک و ل پەرێن خوە دگەریت
تو بێژە من کا ب تەنێ تو فریشتەیی

تە بیر دهێتن ل زارۆکێ مەیێ ئێکێ
ژبەر گرانبوونا شەڤێ مە ناڤێ وی کربوو «بێوار»
چو زۆم نەبوون ئەم وارێ خوە تێدا دانین
چو شکەفت نەبوون ئەم چیرۆکا وێ نەزانین
هەر تشتێ مە ببوو خەونەک رامان نەدیار
ئەڤ ژ هایچوونە هشیار بوونە و
دێ ئەز و تو دگەل پێکا من دیلانێ کەین
ئەگەر نها ئەز و تو ل ناڤ وەلاتی باین
نۆکە مەلا دکرە ڤێری و سترانا مە ژمە دستاند
بەلێ ل ڤێرێ ل بەرامبەر من تو دگرنژی
دگەل تاکێن من و تە داین، تە تەنهاییا شەڤێ رەڤاند
شەرم نەکە هەڤالێ من نڤستییە و نۆکە خەونێن شرین دبینیت
هەمی پارچێن دلبەرا خوە ژ بیرهاتنێن خوە د جڤینیت
شەرم نەکە دا تبلێن تە تێهنا دەستێ من ماچیکەن
ئەها نوها هەڤالێ من و دلبەرا خوە
دناڤ خەونەک بنەفشی را زاڤا و بووکن
ب سەرێ ئەوێ خەونا من بۆ خوە و تە ئاڤاکری
کچا تە ناکەتە گری، زوویە... دا ئەڤ شەڤە بیرهاتنێن خوە ڤەگێڕین
تە بیر دهێتن هەکو ژ نووکا ئەم بووینە جۆت مە شەرم ژ دیواران دکر
ڤەی نۆکە ژی توشەرم دکەی، یان تە دڤێت سەرێ تبلێن من ب گری
وەک تە دڤێت، وەکی هەرجار لەڤەکێ ل رۆیێ من بدە

ئەز حەزدکەم سپێدێ رابم دووری کری
لڤی وەلاتی عەڤر دنشنە کوولانا
ژ ترسا سرێ راڤێن کەفتینە پەنجەرا
دیوارێن مە یێن بناڤ کەتین، ژ پاشناڤێن پەنابەرا
سمبێلێن من پشتی رۆیێ تە داخکرین
ئەز ژێ سلبووم، یێن ژێ کەتین
هەڤالێ من یێ ژ خەو رابووی، ئو پەرتۆکەک من دخوونیت
دناڤ رستێن هەلبەستەکا عەشقا من دا یێ هندابووی
ئەڤە شەڤا مە کوتا بوو،
ل گەل سپێدەهێ ل پشت دیوارێ مە سەرمایا پڕ بێ شەرمە
لێ ل بەر دەرگەهێ مە کوولانەک بایێ گەرمە
سڤک... سڤک تە ئەز بەردام، پشتی کچا تە ژبیرڤە چووی
ئەز باوەر دکەم خوە هێلا بوو هلێڤڕی.

ئەلمانیا - هەلبەرشتاد
١٩٩٧/١٠/٣٠

- ١ -

**((ئاڤكا خوڕ و خوونە، بیهكا بەلگ وەرینە**
**كێزا جوان و تەڕە، مشكێ خوەلی سەرە))**

راستە چیرۆكە و زارۆك پڕ د بازبەندێن ئێڤاراندا گوهداری دكەن
بەلێ شەڤە و ئەز و دیوارێن شەڤێ ب پەنجێن ڕكێ سینگێ ئێك و دو
د كەلێشین
د هەڤڕكیەك بێ داوی دا هەڤ دكوژین، برینێن مە تەڤ ڤەدبن/
شەڤ چركەیێن دەمهژمێرێ و ئەز نكروسكێن خەوا بێداد ڤەدكڤێشین
تو دكاری ئێك بەهانێ ژ من را ببینی، یان ناڤەك دی لڤێ خەمێ بكەی
هەر كەسێ تشتەك لێ نەپەن، هەتا بەلگێن وی ژ پاییزێ نەترسن
هەتا سەر پەشكێن خەمێ د جۆكێن هاڤینی دا نەبن نۆتێن پەشێمانیێ
بیر / ئارینكێن تال ل سەر پانیێن وی درێشن
چونكی ئەم یێن ب خوونەكا كەسەردار فرشك كرین
چیاییێن مە د لاندكان دا ب گڤگڤا بای هار دبن

نه نێره من، ئەنیا من یا بەرەزیڤکی دتەیسیت
هەر تشتەکی ئەز دبێژم گومانەکە و وەریسکێشن
ل سەر کناری هەر پسیارەک تو ژ من بکەی،
ئەها ل وێرێ ئاخینکەکێ بۆ هەلدکێشم
چیرۆکا مە ژ چاخەکی چەرخ سەربرە/
هەر تەبایی دهێتە نک من خور گومانە و کێچن لێ ل جەم من گامێشن
دناڤ رستێن هەلبەستا من دا شێن دبن
دناڤ لفکێن مەبەستا من داشێن دبن
تو ب چاڤێ باوەریێ سەح نەکە من/
ئەڤ چیرۆکە سترانەکا تۆز ل سەرە / ئاوازەک دلڤەکەرە
ل ڤێ سەرهاتیا من سوار نەبە هەمی جهێ گومانێیە و...
هەر کەسەکی ل رۆژەکێ بێگومان سوار بووی/ ل بەربانگا بەندەمانێ،
ل بەر دەرگەهێ تاڤستانێ بەروار دبن
دێ کا وەرە ئەڤێ تو ژ من باوەر دکەی/ ئەز هند ژ بلندی دنێرم/
مرۆڤ د چاڤێن من دا مێشن
دێ تە ل هەسپێ گومانێ سوارکەم/
پشتی ژ هایچوونا باوەریێ دێ راستییا هەر تشتەکی ل تە خۆیا بیت
ئەز دزانم ڤێ چیرۆکێ و ڤێ کەرنەڤالا کەسەران چ دگەل ئێکە/
وەک ئەز دبینم د چاڤێن زارۆکێن مەدا هەمرو ئێشن
هێ ئەوێ تو د میکرەفۆنێ را من دبینی ئەو نە ئەزم، دگومانێ دا،
د بارانێ دا باوەرییا تە هندا بوویە و... کەر و پرتێن دروستکری

هن پەرچەیێن ژێکڤەکری
ل بەندەرێن ئاشۆپێن ب رەنگێ پشیکا کلیلکا خەونا تە ڤێیە و
د هشیاربوونا تە هەلدکێشن.

- ٢ -

**((گیاکێ شینێ ل ددانا، شەرکێ سپی یێ ل گوهانا**
**دەریکی ل دەیکا خوە ڤەکەن دا بدەتە وە چیچ و مەمانا))**
دەرگەهێن ڤەبووی، پر تشتێن نەبووی ژ هزرێن من دەردکەڤن
کولبەرۆژێن ل سەر تبلێن پیرەژنا ژ چووچکا درەڤن
ل پالا چیایێ گووڤەندێ خەونێن هلوەریای/ ژ رۆژێن رەڤ و مرنێ
زیزبوونەکێ ژ من دخوازن/ تەڤن
ئەز یێ ب زارۆکینی فێربوویە خەونێن مری، رەڤا بکوری
دلۆڤانییە، هەلبەستا چاخێ ڤەمانێ
ئێڤارێن بێ ئارامییا شەڤبێرێن بەرپارانێ
ترسەک سپی ژ بیرا من دبن، ڤەدگەڕنەڤە ڕۆژێن من یێن سەرتراشی،
چیڤانۆکێن سەرژێکری بازدانا ناڤێن ب دوری
دلکۆڤانییە، تیپێن بەلاڤێن چیرۆکێ ژ چاڤێن
بەندەوارێن زڤستانێ ئاڤران ددەن ب کومزوری

مەیا ڤۆدکا ژ خەونێن من دباریتن، بارانەک چێکری
مویێن من هەموو شپێرڤەنە/ تبلێن من نەینۆک پێڤەنە
ئەز نابێژم کا ژبەرچی ئەز شەرم دکەم/
لێ چەوا بیت هەموو راستیێن من ئەڤەنە
ل سەر دەهمەنا رۆژا نەڤرۆز/ زارۆکا من ب رکمانەیە،
ل سەر پرچا وێ نهێنیێن سۆر
ل سەر دلۆڤانیا من سەربۆرەکا چەوت/ دووکێلەکا پیرۆز
وەلێ جەژنە، هندەک ژ هندابوونا من ژێرا بەژنە
پشیکا من یا نازدار، ئەو کچا د جەرگێ من دا چوویە خوار
هن پەرچەیێن من یێن دلسۆز/ دگەل ئەوێن بووینە ئالۆز
دکەت ئێڤارەک ئاگری
بۆ مرنا کەڤۆکا دکەت گری
خوەزی بارانەک باری با
خوڕ کەرب و کینیا ڤێ کچێ ڤەمالی با
بلا بەهرا ڕوباری با
هەی هەبوونا هەڤکوشتنێ، هیڤیا من یا دەگری.

- ٣ -

((تۆماتیهنێ، ب رەش و شینێ
ئەڤە یا ڤێ، ئەڤە یا ڤێ، یا کا یا ڤێ؟))
ل بن دارێن بەندەوارێن ڤێ هەڤۆکێ/ چووچکێن تەنگەزارێن

چاڤێن شەڤێ/ د لیستێن خوەدا بێ ئارامن
د پەنجەرا ئەلندێ را ئەز دنێرم سترانبێژەک ب بەرزەبوونێ دستریت
مژەکا تیر ژ سەربۆرا من دباریت
پێنگاڤا کورت وەرگەریانا هەتاڤێ یە
ئەڤ کێڤرووشکێن ژ رۆژێ دوەرییێن بیژی یێن فرشک حەرامن
تە چ دڤێت ژ من ب خوازە/ ئەز تشتەکی نادەمە تە/
ئەز و باران حەژ ئێک دکەین/
هەر تشتێ ژ ڤیانێ چێ دبیت دڤێت وەنەکەین
گەر تە تشتەک ژبیرکری یە/ دێ بێژم تە..
هەر ل وی چاخێ مرن داتێت و
ڤالا دبیت ژ رامانێ
سێڤێن چەمێ مامێ حەسەن/ ل وێ خالا بنێ تاخێ/
ل بەر هەتاڤا تەباخێ/
ژ ئاڤێ دمێژن رەوانێ
رەڤێن مێشخوەلیکا ژ هەورێن دویکێلی دترسن
بێگونەهی دڤان چیڤانۆکێن بچووک دا گشت هنگامن.

- ٤ -

**((کچکچیسکێ... بینە تپلا لەلالیسکێ**

**یان دێ تە خوم حەمحەمیسکێ))**

ئەڤ پەیڤێن هۆڤ، بۆ منێ زارۆک کاڤکاڤ دبوونە درۆڤ

ل بن خالێن گەردەنا چاخێ بێ هژمار،
من هەست نەکر رامانێن پەیڤێن درندە دبن بارۆڤە
بەندەواری د چاڤێن ڤان پەیڤێن هۆڤ دا هەر تشت دهێت باوەرکرن
هەلبژارتن د چاڤێن سۆرە گولان دا تەنێ مرن
هەو دکارم ژبیر بکەم بالکێشەکا ناڤەرۆکا،
پەیڤێن تورسی، بەلگەنامێن شەڤەرۆکا،
پرندەیێن چیڤانۆکا،
ل ناف پەنجێن خاتوونا شەڤ،
ئالۆزترین گێژەڤانگا بیرێن بهاڤکورتێن زارۆکا،
ترس شێن دبیت.. دبن درندە هەموو مرۆڤ
د هلبوونا ئێڤاران دا بێ بەربانگە، و ئەز ژ نڤستنێ دترسیام
چونکی خەو، نە دما ئەو، دەمهەژمێرێن مرنا ژ درەو.

١٩٩٦/٣/٢٠ دهوک
ل کۆڤارا گازی بەلاف بوویە

# پرتێن زانەسەرێ

تو نەهاتی
و دناڤ بیرکرنا تەنهایێ دا..
ئەز بهۆژیم ناڤ خوناڤا «ئەسپرینێ»
ل خەونا من یا هێشتا نەبووی هێدی دەستێ خوە درێژکە
نەینۆکێن من هەر د تیژن، تبلێن من یێن بووینە شلێر
موویێن برهێن من بوونە مار، د بایەکی وەرهایی دا
تو پەریا د خەونێن من دا بوویە بووک
گەر تە دڤێت ئەز ژ بووی تە پەلاتینکێن خوە ب سوژم
گەر تە دڤێت ئەز دێ ب مرنا پەیڤێن مەست گرنژم
ئەڤ تبلێن تە یێن مارکەستی چ دلەرزوکن
تو کولیلکا بنەفشانی، دلێڤا «رێ» را تو خاڤ دبی
کا دەستێ تە... کا هەستێن تە دا بکەمە ئێک
لێڤێن تەیێن سنۆرکری رەبەنۆکن

ئەز حەزێن خوە نافەشێرم، د سەرابا ئەشقا تەدا کەمەربەندا من ئاسنە
کا وەرە تو تەنها روینێن، دا پەیڤێن من بگەهنە ئێک د هۆزانەک گەهایی دا
تو نەهاتی و د شیلاڤا ڤالیۆمی دا هەرفتی بووی
بەری نۆکە د هزرێن خوەدا من تو جارەک دی نژنی
کچکەک نوودەم، چاڤێن تە ئاسۆ دبڕین
کادێ وەرە، ئەڤ پەژیا دبێژنێ خەم... ب سێپێکا ماچێ ڤەکەین
ل گەردەنێ ب ئالینێن کەنی.
خەبەر دامن بەری تو بێی
من حەژ تە کر پێش من تو بڤێی
بۆمبێن ڤالیۆم دشانێن خوونێ دا دپەقن
بیرهاتنێن بچووک.. بچووک دبن «ئەلبۆم»
دناڤ تەڤنێ کولۆخەی دا پەشکێن «ئەتۆم»
گۆتن ژ دوهی نڤستی بووی
ڤالیۆم دپەردێن سەرێ تەدا مەست دلەیزی و
ب مەستی د پەرێسگەهێن زەردەشتیان ڤە
دناڤ بەلگێن «هەومێ» زەردا بەلاڤە دبوون
خەونەکا تە جلکێن «ڤەهۆمەنی» ل بەر بوون
تە «مەزدا» بۆ «ئەهریمەنی» ل بەر بوون
تو نەهاتی، گۆتن «نشتیمان» یا نەخوەشە
دژۆرەک هەرفتی دا، ل شوقێن تاخێ گرێ باسێ بێهای دبیت
ژ هایچوونێ دبیت سپیندار
گەر ژ خەو رابوو/ ژانە سەرا وێ تەنابوو

دێ پەیکەرێ «ئەناهیتا» د شەڤا شاری دا بیت ئالا
تو دێ بییە «کەلیا شەدا» ئەز ژی ئەو کەلیا بەرامبەر
تو زینی و بەژنا تە بووکە، ل سەر بانێ «شکەفتا چارستووین»
ئەز دێ لێڤێن تە راموسم، تو هەلبەستا من ماچی کە
ل هنداڤی گۆلا «ئۆرمێ» هەڤ هەمبێز کەین
دگەل یاخیبوونا هەتاڤێ، ب لەزا تاڤێ بێن کەسکە سۆر
ئۆ بەرەف ژۆر دێ هێیینە خوار، خوە هاڤێیینە درۆیێ شێن دا
دەستنڤێژا خوە ب کریسکێن تاڤێ گرین
ل سەر کەڤرێن «ئامێدی» یێ خوەتافیرکەین
خوە ژ هەستا سۆفیا دوورکەین
ئەز تەڤ سۆزێن خوە د بشێڤم، نە ڤەگەرە
نۆکە پرتێن ژانەسەرێ و ڤالیۆما ل سەر تەڤنی شەڕە
ل بەندەمانێ پێن من شێن بوون، پێلاڤێن من بوونە سوار
تو نەهاتی و بۆ دەمەک کورت ژ خەو رابووی
هەر چار دیوار گێژەڤانک بوون
ب چەرخێ چاڤێن تە دزڤڕین، ب تەنێ ئەزەک ل بیرا تەبووم
دناڤ پارچێن هەلبەستێ دا ب بووم ئادەم
تو ژ من بووی، ئەز ژ تە بووم
من د پشت تەڤا دیواران را هەست ب تە کر
پێنج و نیڤی ئێڤاری بوو، هنگور ب چارلەپکا دهات
پێن تە گولیێن گەنمی بوون بای لێ ددا
ئەز سەر شویژنێن هشیارێ ببووم بیڤەلەرزەک ترسێ

گەر ئەز نۆکە تە ببینم وەک ڤۆلکانێ دێ ژ نیڤا پێکا مەی دەربم
تو ئارام بە و ئەز دێ د چاڤێن تەدا نقم
ئەڤ ژانەسەر ڤالیۆم کوژە
ئەڤ زارۆکێ تەیێ جوان و د سینفێ تەدا بوویە کۆڤان
ناهێلن ئەز تە بنێرم، نە ژ تە ب رەڤم
تو هنگامی و د فەرهەنگا من یا کوردا
کچا خوداڤەندێ پیری، نشتیمانا خەونێن تیری
ئەڤ زۆرداری ل تە دهێت کرن
د بازبەندا ئاگرین دا تو پەساری و نقشتۆکان تو ڤەخواری
خوڕ خەونێن تەیێن ڤالیۆمی دهێن بارکرن کولیلکێن نێرگزا زەربوون
ئەوا بۆ من خەبەر ئینای نە «هۆدهۆد» بوو
کانیکێن «جەنگیزا» دەربوون، ئەوێ حەزێن تە ڤەکوشتێن نە «داود» بوو
هێفکە شکەفتا «هەلامەتا» شوون پێ دێوەک داگیرکەرە
ئەڤ هەلبەستا من ب ژانە و نۆژداری دەه ڤالیۆم دانێ
گرێبەندا ئاسمانێ وێ ب ژانەسەرە
د چار سوویا گووڤەندێ دا تو گوهەکی و
تەنێ گوهەک د بەروێکا داوەتیادا بێ پێژنە
دناڤ تۆرا پەراسوویان دا ڕەکەهەکی و
بارا پتر ئارەزۆیێن تە نشتیمان بوونە دووکێل
ئەڤ عەڤرێ رەش د خەونا من دا سەروبنە
ئەز یێ د خیچا گوڕۆڤردا تو د میحرابا چڤردا
تو ژ کولیلکێن پیتانۆکان هاڤی ببە و

ئەز دێ خیچێن هۆڤێتیێ کەمە پڕەک
دێ دەرباز بم.. تۆژی وەرە/ پێخواسی نە شەرمە
د هاڤلدا ئەز و تو دێ ئێکبوونێ کەین
ئافراندنا بەربانگەکا ژ دەیکبوونێ کەین
ئازراندنا هەستێن نڤستی و ئەوێن نڤشتی و
دمەژیێ مریێن ئەفیۆنێ دا نووبوونێ کەین.
تو نەهاتی و ئەز یێ ل سەر پێلاڤێن خوە رونشتیمە
ئەوا بۆمن خەبەر ئینای، بوو سەهۆل و هەتاڤێ بر
هەر جارەکا رۆژ دهەلیت، ئاڤا دبیت
ئەو رێکا ئەز بوویم زێرەڤان ل ژڤانێ مر
دەرگەڤانێ بانگەکی بووم، نە هەلدێرا
دناڤ بۆویێن ئەلندێ را، من ڤالیۆما تە وەرگێرا
ئەز هشیاربووم، تو مایە د خەو، ترساندییا حەزێن کوشتی
پرساندییا هەلبەستەکا پرت پرت کری
ئافراندییا ژ سەروا و کێشێن کەهی سلبووی
ئەز دێ فڕم، تو ژی وەرە و ب فڕە
وەرە و ب فڕە و نەمینە بێ پێژن چونکی سەبرێ من یێ پڕبووی
دیتنا من یا زراڤ و گۆرۆڤڕ بووی
ئەز د ترسم ئەڤ خوڕ رۆژێن بەندەمانێ ئاڤا رۆیێ من ب رێژن.

دهوک ١٩٩٧/٥/٧
رامان

# جوانترین سەما

ئاڤرێن تە کولیلکن،
ل بەهارا هەستپێکرنێن من یێن بچووک
لێ گۆڕێن تەنگ و تارستان
گولێن تەنگ و سۆرستانا لێڤێن تە دو دلیا من ڤەدکوژن
هەکو گۆڕ تەنگ دبن، دزانم مرنە ئێکجاری
ل جیهانا من یا نهێن دمریت تاری
ل بەر تیرۆژکێن هەتاڤا ئەڤینا تە مە پرتێن ژیانێ ڤەدخوارن
ل شەڤا کەوا کوپێن چیا ماچی دکرن
بدەنگێ ماچا بلبل مەست دبوون، هاتنا هەتاڤێ ژبیر دکرن
ئەز بترانا دخاپام، خاپێن تەییێن پاخلا شەڤێ
تڤەنگێن دیتنا رۆژێ د من وەردکرن
سێ لب پرسێن من دهاتن تە ب گەلوازێن ڤەهۆناندی

بێ تەڤنێ دۆژەها مرنێ کەڤۆکێن کوولی هیدکرن
ئاڤرێن تە خانیێن تەژی رۆناهینە
شەڤە و ئەز دبێژم بارانا دهێت هندەک عەڤرێن تۆرە بووین، تاری هۆڤە
با ، ژ ترسا تۆرەبوونێ تاژیەکا ترسنۆکە و سەگەک وێرەک
لسەر پرچێن دارۆبارا دبیت باروڤە
ئاڤرێن تە ژڤانێن کەسکن، سۆزێن مۆر و مسۆگەر و مسکن
ل بەندا بڕیارا بنەفشەیا پەرلەمانی.. ئەز ئێڤاری یێ هۆسا بووم؟
دبیت نەهێتە بیرا تە خەونەکا سپی
وێهە رەشێ - نالبەندی - یە دناف سیبەرا دار گوزێ را
هناڤێن وی ئێتوونەکا ئاگرینە و دو پشیکێن گوهێن وی دخون
دووکێلا دبیتە کڤانە و تیرا دهاڤێتە دەڤەرێ
ئەڤ هەتاڤا هەی نەوێرۆک دکەلشتێن دیوارا را بژۆر دکەڤیت
دبەر تەنشتێن سوارارا برێ دکەڤیت
دناڤرانا ژنکا هەیا دەهمەن پیس را بێلڤ دنڤیت
هەما سەحکە شەلوالێ کالێ سەرادە و
دناڤبەرا من و تەدا پەردا ژڤانا یا ستوورە و
پرۆژەیێ زارۆکەکی ل سەر کەڤالە.
ئاڤرێن تە ساچێن زنار و زڤنگا
دناڤەندا شەڤا من یا نێرگزی دا هۆتەرن
ئەز ئێڤاری یێ هۆسابووم؟
دبیت نەهێتە بیرا تە یاریەکا مەست

ئەوێ سەر بۆز ببوو نۆژ و بدەهمەنێن مرنێ ڤە رسیا
ل بن لڤینا ئەلەمتریکێن ترومبێلێ
دەنگ ل ئێک و دو سوار دبن
رەنگ ژ کریسکێن لێزەرێ دژوارترن
د چانتێ وێ کچا هەدا وێنەیەکی پەشێمانبووی
هەلبەستەکێ ژانێ دهێنێ و گورگەک دێ بیت
زەلامەک یێ ل بەر زانێ و گورگەک دێ بیت
ئاڤرێن تەز ژ هایچوونەک یەزدانینە
د پەرێسگەهەک بۆدی یان دا
دبیت نەهێتە بیرا تە شیردانەکا ب دلۆڤانی،
ئەز ئێڤاری یێ هۆسا بووم؟
هێشتا دوهی تو ڕۆبارەک بەهاری بووی
د سۆربوونا رەنگێ تەدا ماسی د ترسیان
سۆر بوون رەنگەکی ماندی بوونێ بوو
سپێدەیەک زوو و ترومبێلەکا شووشە خویسار سنورێ چەند شارا دبڕی
تەمەت ڕۆبارەکی درێژ تویا جوان بووی
تەمەت دوورترین رێک تویا بژان بووی
ئەز دا ل ژڤانا تە مینم گەر تو ل ژڤانا من نەبای.
ئاڤرێن تە گیانەوەرن، د تاڤیەکا پایزێ دا
د بارنە سەر هشکەلێڤێن دیتنا من
تە ل بیر نەبوو هەکو بیرێن تە هندا بووین

ڤاریبوونا پەپوٚکێ و کەسکە دیوارێ هەڤرستی جوانیەک دا بوون بەفرێ
تو هشیار نەبووی هەکو تو ژ هشێن خوە جودا بووی
هوزانەک دناڤ قەهوێ دا دکەلی
هوزانڤانەک ل سەر برجا «ئەلکساندەرپلاتس) ل تەرمێن جوهیا د نێری و
خوە ژ پەنجەرا برجێ هاڤێت... بەرلین هەمی ببوو ترسەک
ئەو زەلامێ پەناهند و ژ ئەفریکای هاتی نانی
ل بەر دیوارێ ئەوێ کوردێ چیروکنڤێس
ئەو و سیبەر دناڤ خوونێ را ببوون پرسەک.
ئاڤرێن تە شووشەک ڤالایا ڤوٚدگایێ و
ژ دەستێن زەلامێ هەیێ مەست دەرناکەڤن
تیشکێن گوٚلوٚپێن درەنک شەڤ جوانی و مەستی کربوون دیەن
ژبلی بەتلەک شکەستی یێ بیرێ هەمی تشتەک ببوو ئاشوٚپ
نە فریشتە بووی ئەگەر دا ئەز تە پەرێسم
تە راستی ژی نە گوٚتە من هەتا باوەر ژتە بکەم
تو ئازری بووی.. تە نە دهێلا
بێهنێن کەهی شکەفتێن دفنێن تە بهەلکێشن
سەرنجا تە ل پەنجەرا ئوٚلیەکێ بژوٚرکەت
دو چاڤێن رەش هەمبێز کرن
تەنێ سترانا دوورییێ ب خوە و تە دبێژن
ئاڤرێن تە کەڤوٚکێن ئاڤرمووشینە
ل بەر دەرگەهێ دێرا دامتوٚر وێنەیەکی دگەل من دگرن

ل بەر دیواری د هەلکوولا بەلکی تەراتیەک تێ هەبیت
تە حەز نەدکر بێهنا کەبابێن ژ درەو بییتە لەهی و
ب سەر کنارێن گیانی دا بێن و جێن بمرن
ئاڤ دکانیادا نەمایە و ئێلیوت دێ ژ خەونا ڤالە بیت
دگەل پێلەک بای دهات گوهێن تە دەنگێ شەڤبوویێ و بێهنا من
بەری حەزێن تە ڤالا بن خولیدانکا تە یا جگارا پڕ ببوو
ب ئارەزۆمەندی زارۆیەک ژ پێن خوەیێن تۆرە دبیت
ئاڤرێن تە کو حەزەکا پاشرۆژینە
ل یاریگەها شەڤ و چرا و پەلاتینکا بینەرن
تە گەلەک حەز بێهنا شەڤبوویێ دکر
لێڤ ژێ دهاتن کوپیکرن
ئازری بووی د هەست پێکرنێن خوەیێن مۆردا
تە نەدشیا هەستێن تە دەنگێن بنەڤشی بکەلێشن
گەلەک گونەهەکا مەزن بوو تەکر
ژیان ئەڤ یاریا بترسە د بەندەرێ دا
د هەست پێکرنێن بێ دەستووردا
بلا چیایێن ئارامێ ل سەرێ تە بدەن
گوهێن تە چەکچەکویلەنە و
دفنا تە مەیمونەکە و چاڤێن تە مامزن
ئاڤرێن تە بێریڤانێن کۆچەرینە
ئاوازێن هەفکا من د دۆشن

ئەز و تو نە خەونەکا ڤی چاخینە
ئەز و تو نە چرایەکی هەلین
ل سەر تەختەبەندەکا کەڤن
ژۆرا مە ژ چار تبلا ویڤەتر ئەز دبینم
ئەگەر ئەز تەڤنپیرک بام و تو مێشەکا نڤستی
من گونەهـ دکر تە ژ خەو راکم
ل ناڤبەرا مە باج نینە ل سەر ئاخڤتنێ
بنەڤشی بوون دبیتە رەش
سپی بێ رەنگە و سۆری بێهنا وی یا شکەستی
تو تەڤ رەنگێن دی بدابێشن
ئاڤرێن تە مۆزیکەکا چیاینە، چەند جوانە تو پەلاتینکی و
چیا و دەشتێن دیتنا من خوربەهارن
د بەرویکا من دا شووشەکا گولاڤێ و
هەرسێ تیپێن ناڤێ تە ل سەر دیارن
سینگێ من موویێن زۆرێن لێ هەلداین
ئەز باوەر دکەم گەرماتیا وی ژ نەرماتیا بالیفکەکێ ئارام ترە
ل سەر لێڤا بۆیمباغا من تەژی بیرهاتن و دیارینە
گولەک بچووکا بدەست کری نەخشێ تبلێن تەیێن زێرین
خور حەزێن من ل ئەڤێ گولا بدەست چێکری دبارن
دیتنا من ئاسۆیەکا گەش و روهنە
خو تو نەبووی ل شەڤا ئەز ل پەی تە دهاتم

دبێ دەنگی یا تەنێبوونێ دا
من شەمالک دکرنە ستڕانک د پێنگاڤێن هەتاڤی دا -
د گەردەنا بێ پیڤانا تاریێ د دانان.
ئاڤرێن تە درەڤشەکا چاڤەرێنە ئەز هەلگرم
تو د بیرێن من دا شەڤەک ساهیا بەهاری بووی
دگەل من دهاتی و هەڤالەک بووی
دبێ دەنگی یا دارستانێن ڤالیندوورف دا
بستێن سەرمایێ ستویر دبوون
ئەز د کەفتم و رادبوومەڤە بێی کو ئەز هەست ب ئازارێ بکەم
ئەو تێهنا ژ تە دناڤ من دا گەرم دبوو
نە د هشت سەرما من بهنگێڤیت
دناڤ سترانەک دلڤەکەردا ژین د بوومەڤە.
چەندا جوانە تو هەلبەستی د چەم و چاڤێن هەستا من دا
ئەفسانەکا هشێن پاشەرۆژا گەردێ
ل ژۆرا من تیرۆژکێن ئێڤارەک ئارام هەکو دەریاز دبن ژ پەردێ
ل سەر دێمێ تە گیانێ من دکەن گولستان
ئاوازەک رۆک دهێتە لێدان ئەز و تو رادبین سەمایێ،
مە بڕیار داهبوو جارەکێ دەستێن خوە
د گەردەنا ئێک دو ب ئالینین هەتا هەبوونا دنیایێ.

دهوک ۱۳/۱٤-۱۰-۱۹۹۹

# داڤەک هەومی بۆ پێکەڤان،
# پەیامەک بۆ پەیامبەران

هەکو جارا نەینۆکێین من دبنە پەنج و دەرگەها لپیستێ من ڤەدکەن
ئەز دزانم هەوە بیریا من یا کری
وەکو چاخێ سەروچاڤێن من بەرزە دبن
ئەز دزانم وێنەیێ من ها نۆکەژی دچاڤێن وەدا یاریا دکەت
چاخێ لێڤێن من دبن جهۆر، پەیڤێن من تەڤدا دبن بخور
ژێ بلند دبیت دووکێلەک سۆر
لێ دیسان ژی ئەز دزانم کەنیا من یا دگوهێن وەدا
نە نڤستە و خوداڤەندێ هەلبەستا من
ل بەر دیوارێ مزگەفتا وە یێ بووی پەیکەر

بۆ ئەفریتێن شەڤ و رۆژان نڤێژا دکەت
گەلەک چاخا ئەز و تبلێن خوە دگەل ئێک
خوە مژولی یاری یێن ئەفسانان دکەین، لێ پشیکەک ناهێتە ژۆر
تبلێن من ژی رەنجی نابن، ئەگەر پەیکەر مان راوەستیای دێ ژەنگ گریت
ئەز ژی گەلەک حەژ ترانێن درِندا دکەم
گەر کو گوهێن من د خورینن
ئەز دشێم عەڤرا بکەمە پاپۆر
د مۆریا من دا وێهە (قوچان)ێ بوویە شەمالک
وێ هە (سەلمان)ێ بووی گوری
وێ هە (شوکری) یێ بووی پەلاتینک دهێت ئاگری
وێن هە دو چەنگێن سیمەرخی دو فنجانێن نۆژێ پیێڤە
دبرینێن من را دهێنە ژۆر.. چ تەبانە؟
هەمی چاخا گەشتەکا دوور و درێژ دکەن
هەما بدزی لبن کەفشێن من جهگیر دبن
د ناوسکێن میترایان ڤە د لوێێن خوونێ دبینن
لێ هێشتا ژی ئەز دزانم هەوە بیریا من یا کری
هەکو هەستێن من داڤکێش دبن
ئەز ژ نێرینێن چاچان دترسم
ئەز هەست دکەم هوون یێ د هزرا مندا شینبووین
من ژی بیریا هەوە کریوو
سەر ئەنجامێن ڤێ بیرکرنێ

د پەنجێن من را وەرارێ دکەن،
دبن نەشتەر، گەلەک دژوار من دئێشینن
ل دەرێ خواندنگەها ئەز لێ هەمی رۆژان
مرۆڤەکی سەیر و کاسێتەک مەزیکێ ئەز دبینم
دگەل لڤینێن کلاڤیرێ لەیسکا بالێ وەک مەستا دکەت
کو حەزکرنا وی مشەخت دبیت وەلاتێ ئەو پێش ژێ هاتی
سەروچاڤێن وی دبن ژویژی و یاریا یۆگا ل سەر دەستا دکەت
نو هێشتا ژی ئەز دزانم هەوە بیریا من یا کری
د دەرسخانا رێزمانێ دا موویێن من تەڤ
دبن ئالاڤ و پەیڤا بێ ئاوا ددەنە هەڤ
دبێ ئاوابوونا پەیڤان دا شادبوونەک بۆ من پەیدا دبیت
ئەز کولیلک و خەنجەرا ددانم بەر ئێک
ئەز دشێم خەتیرە و پەنجەرا بکەمە ئێک
ئەز دشێم هەمی بەلاڤبوونێ بکەمە بادەک
ئەز دشێم رێزمانا لالبوونێ بکەمە دادەک و
هەمی سەرکەفتنێن ژ درەو ئاڤ بکەم رەڤ
لێ دیسان ژی ئەز دزانم هەوە بیریا من یاکری
بیرییا من هەوە یاکری/ من یا کری بیریا هەوە
یا کری هەوە بیریا من/ بیریا هەوە من یا کری
لێ دیسان ژی لالبوونا من هوون تێدگەهن
پەیامبەرێ راماندنێ ل سەر پەیڤێن هێکا دکەت

دا ل بن سها یاخیبوونێ ژ دایک بێن پەیامبەر و
ئالاییێ رامانا هەلدەن
دا هەر ئەزەک فەیلەسوفی دخوە بگەهیت
دا کەس خەفکێن بەندەمانێ ل بەر خەونێن خوە ڤەنەدەن
هەر تەپکەکا من بۆ پەنجێن خوە کوولابیت ئارامی یا من دکەڤتە تێدا
جارەکا دی ئاشۆیا من حەز ژ پیڤانا رێکا دکەت
هەر دیسان ژی ئەز دزانم هەوە بیری یا من یا کری
هوون دشێن رستێن من باج بکەن
هنا ل سەر کومتێ شەدا و هنا ل چەپکێن بابلۆ
رامانێن وانا خاچ بکەن
گەر وێنەیا بەروڤاژ کەن ئەز هوونم و هوون ژی ئەزن
هەروەکی هەر ئەز دزانم هەوە بیری یا من یا کری
هەروەکی هەر هوون دێ زانن کو من بیریا وە یا کری.

Lubeck

د چاڤێن وەستیاییێن هەبوونا بێ سەراشوونا ژینێ دا
بێ دەنگم و ژ هەموو لایا نۆبەداریا دەنگا دکەم
بەرەف من دهێن، هن ل سەر پێیا،
هن ب چەنگا، هن دناڤ خالخالێن کینێ دا
کچکەک جوان و زارۆکە.. یاریا ب پرچا خوە دکەت
د چاڤێن وێ دا هەموو لڤین دبن ئێڤارەکا برسی
رۆژ هەسپەکی ب سێ لنگایە، ڤ بن لێمشتا دەنگا دکەڤیت
بایەکی سار کێلا بەژنا وێ دهەژینیت
پرچا تە دبیتە زڤرۆکەک بارانێ
زەلامێ هە! دەستێن وی یێن بووین تەرازوو
لێدانێن دلێ من لبن سمێن بارانا بەزەک دبن برووسی
تویا زارو دڤێ کوولانا سێوی دا گوستیلانێ ب هزرا دکەی
دەنگەک سترانکی و پەریشان سەراڤ بناڤ..
مش.. مش: شەش سەمۆنە ب پێنج دیناران

دەنگەک درێژێ بنەفشی دبیت کراسێ ناڤەک تورسی
هەرێ.. ؟ تو دبێژی ئەڤ ناڤێ هەیێ رویت ئەفسانە بیت؟
دکوژیێن بەر دریایێن پییێن تەدا هندا نەبیت
فریشتەیێن رۆناهیێ د کوولانا تەژی دەنگدا دبنە زڤرۆکەکا کەسکا
گەنمی، پێشمەرگەیەک ژ تڤەنگا خوە ترسیای ب تییەک چاڤی
دنێریتە بۆچمێ گوشتفرۆشی، لێ بیرا وی تشتەک نەپەن یا گرێدای
ل بن دارەکا هێشتا پێناسا وێ بەرزە هەپارەکە
ئەڤ چیرۆکە هندابوونا ڤێ کوولانا بێ دەلنگە
ناری ب خوونێ هەڤیر دکەن، هەستییێن مریا ل بن کوچکی دبن چریسی
لێ ئێڤارە و دبیت من بیرا مال کربیت، تویا زارۆ تەنێ لڤینەکا بچووک
دڤی وێنەی دا، تە بیرکریە دێ ئەڤ شەڤە ل کیرێ نڤی
هەڤالەک من کو هۆزانا خوە فرۆتی دابوو ب چوونە
سێ کت رۆژا ل چوونەی دگەریا
هێ وێهەیە! ل کوژیێ دکانا هە شین بووی،
چووچکێن برسێ چەرمێ سەرێ وی درەڤینن
ڤێ جالدەیێ جهێ پێیا لێ نەمایە، ب دووربینێ لێ بنێرە،
ئۆتومبێلێن بووینە ریسی
ڤەی چاڤێن تە د گێلەشوکا دفنێن تەزی دا د مەستێ
هەردو ڤامێن رێ پیڤانە/
هن بگەزێن دفن بری، و هن ب تەرازووێن درەوان
مرۆڤ بوونە ئویشێن تری و ناڤ ل خوە گەستێ

ڤەی هەبوونا تە د ژیانەک هۆ بەرتەنگدا پڕ تشتەکی ئەنتیکەیە
چووچک دناڤ ئێڤاران دا خوە دپرچێن سیڤاندان را دهاڤێژن بەختێ لیسی
تویا زارۆ ل بن ڤەرێژا بارانێ تلومل وەک وێ ژنکا ل سالا (ئەنفالێ)
نیڤ شەڤەکا بازێر بێدەنگ دەرگەهێ مالا من پالدای
ئەز نزانم نە خەونێن من د بەندەمانا ئەلندێ را
ئارمانجێن سپێدەیێن تازی دپەرستن
ئەڤ ژ سالا ئەم رەڤینە سەر سنۆری، مە شەر دگەل بەفرا ڤەرسی
کا بێژە من تو چی پەیڤان تێدگەهی؟
دا بێژمە تە ئەڤ پەرچەیێن شارستانیێ
د ئیستگەهێن پێش جەژنێ دا کۆچەر، گوندی، دبن جندی
لێ تویا زارۆک ب تەنێ کولیلکێن ئاشۆیا دکەیە بەر بەژنا شلوڤەیا لاواز
هزار خەم و خەم، گولێن هەناری ب بەژنا تەڤە دبن گەلواز
تو ژ سەری هەتا پێیا یا بوویە چاڤ و یا د تەیسی.

١٩٩٦/٢/١٦ دهوک.. کوڤارا گازی

پەنجێن تیژێن غەریبیێ د بەرۆکێن من دا دهاتن و دچوون
دەستێ من وێنێ تە گرت و موویێن من گشت رابوونە ڤە
من دیتنێن خوە ب ئارافان تافیر دکرن
ئەز دترسیام ئەگەر وێنێ تە ماچ بکەن
ب تەنێ بێهنا غەریبیێ پیس بکەتن ئەڤی گەردێ
ب حەز کرنێن بیرهاتنا دێ ئەڤ شەڤە
دگەل وێنێ تە شەڤبێری یێن غووربەتێ کەم
ل سەر پەنجێن دەمهژمێرا چاخ هندا بووی
بهەستێن خوەیێن ئاڤرمویشی ئارەزۆیا ڤەگەرێ کەم
هەڤالێ من کاسێتەکا سترانێن مەستە
شەڤ هەمی ئێک بهۆست یامای
سترانەک من ب تە دبێژیت ((کەسی مسلی تو نەبۆد
کەسی مسلی تو نەشود))
ئەز و تەنهاییا بنەفشا و ئەڤ سترانە یێن بوینە بەلگ
ل بەر هۆرەبایێ پاییزێ ((زندگی با عشقی تو))
هاڤێ گاڤێ تو نێرگزەکا یاری کەری
ل بەر سیبەرا ئاشۆیا من کەنییا تە یا بووی هارمونی و...
دگەل پەیڤێن هەلبەستەک مشەخت
هزرێن من یێن بووین پەلاتینک ل بەرکینا بابەلیسکێ

دێ ناڤێ تە کەم نشتمان، بلا ل بەر ئاشۆپا من بیت
ڤێ هەلبەستێ کەمە ماچەک دا دیاری یارا من بیت
ئەینۆکێن خوە د سینگێ من دا ببە خوار و بکە پەراسوی
ب تەنێ دەرگەهەک ل تاقە و بلا دلێ من نەرەڤیت
نڤێسینەک مزماری یە ل سەر مژیلانکێن دیواری
ئەڤ هەمی ژیار و ژیانە شووشەیەکە و بلا ژ دەستێن تە نەکەڤیت
مرۆڤەک د ژۆرا من ڤەیە، پێنۆسێ خەونا دخوونیت
هێشتا گری دکەنیا خوەدا دخەندقینیت
کچکێن سەرمەستێن ترياکێ کوڕکا درەڤیننە پارکا
لێ من خەونێن باژێڕێ خوە ژ بیر نەکرنە و
تە ب تەنێ بێنا مۆر یا هەی، تە ب تەنێ لێڤەک سۆر یا هەی
ل چاخێ هاربوونا گوهارکا
خور کولیلکێن ڤی وەلاتی دیاری تە بن چوونابینم ژ تە جوانتر
هەکو حەزێن من کیشوەر و سنۆرا دخون
هەمی چیا ل بن پێن تە دبنە گر
هەر ناڤەکی ئەز ل تە دانم نشتمانە و شاهرەزادی
هزار و ئێک ئەفسانەیی
دگەل سمفۆنیا مشەخت بوونێ
وێنەکی تە هەمی کاڤا ژ بەریکا من دهێتە دەر و دچاڤێن من دا ب زۆر دکەڤیت، وێنەک هەلبەستێ دئافرینیت
دلبەرا من دوێنەی دا کۆرتەک مۆرە و فستانێ وێ گول بنەفشی

تو ل کیڤە بی خەونستانا دیتنێن منی
کەشتییەکا ماچا چێدکەی و پەنجێن غەریبیێ دپەژنی
ل سەر پرتێن عەڤرێ نێڤاری یا هێدی دمەشی
ل مشەختی یا گولا ژ گوهارکێن تە دکەم
چاڤێن من یێن بووینە کانی و ژ پەنجەرکا دهێنە خوار
لبەر پەنجەرا نامویی یێ شین بۆ سەرما
پەنا بەر بەلگێن هێش کەسکن، د وەریێن
جار و بارا دبنە چووچک و خوە ناگرن ل بەر پێلێن بایێ دژوار
ئەز و وێنێ تە ب تەنها دێ شەڤەکێ ئازرینین
ئەڤە چاڤێن (سان جون پیرس) دگەل قەلەمێ من بووینە جوت
توژی بەرێ خوە بزڤرینە
دەستێ ئەوێ کچکێ بەردە و موویێن سینگێ من بچەرینە
ل سەر ئەڤێ هایسۆنکا من یا گەرم
ئەز حەز دکەم تو ببی بارانەکا سڤک دا لێڤێن من خویساری بن
پرتێن تەییێن بووینە تیرۆژک و د ئاخڤن
ئەز یێ دین بوویم بڤێ نێرینا جادۆیی
هەر کچکا بەژنا وێ بلند ئەز دبینم هەر تو ب تەنێ
ئەز نوها یێ هزر دکەم، ئەم هەردوییێ دناڤ دارستانەک تاری دا دژین
هەلبەستڤانۆ ((هزراخوە بینە ل مەجانان))
ئەڤە رستا کەڤۆکێن تە یێن پەیڤا بوو
ل سەربۆرا چاما من شاراندی ئەڤین

تو ل بەر دیوارێ رامانەک من رونشتی بووی
هەر گرنژینا ل سەر لێڤێن تە بوویە جێمک
ب ئاخینکەکێ پەلاتینکێن بەرسڤا من دهاتنێ
تو گولەکی، تو ئاڤەرۆکا جوانی یێ
هەر بهۆستەک ژ تە دوور کەتن
دبیت چەرخەکی پۆشمانی یێ
ئەز و تەنهایی ئەڤ شەڤە و دەنگێ کەمانەکا خەمگین
ئو سترانەک بیرهاتنێن گەلەک رەنگین
ئەڤە چەندە مەی ژ پێکا من خلاس بووی
مەست بوونا من یا گەهشتی ژ های چوونێ
هەڤالێ من یێ نڤستی دارەک هنارێ دبینیت
بەژنەک چنارێ دبینیت، لێ خوونا وی پڕە ژ خوونێ
هەمی نێرینا وی پیتەک ئارام نانڤینیت
ئەز حەز دکەم دا ئەز و تو د ئەڤێ شەڤا مەست بوونێ دا
رامانێن بێ پیڤان ب رێسین
تەراتی یا لێڤێن ئەڤینێ بکەینە پێکا
شەڤبێری یا من ئەڤ شەڤە هەڤژی یە دگەل مرنا خەما
دێ نۆکە ئەز بیرهاتنێن تە ماچی کەم، حەزکرنێن من دبڕن رێکا
گەر بزانی ئەڤ ماچا من چەندا گەرمە دا بهۆژی
گەر بزانی ئەڤینا من چەند مەزنە، دا من دهزرێن خوەدا کوژی
ئەز پتر ژ کوشتنا کەسەکی یێ دناڤ خوونا بیرهاتنێن خوەیێن تەڕدا

ل سەر لێڤا ڕۆبارێ (زێ) قوربانەکێ ل سەر دەستێن من
دێ هاڤێژم د ئاڤا کووردا
ئەو هزرا تبلێن من خوارین یا درێکەکا بێ ڤەگەڕدا
وەرە دا ئەم کەڤرێن عەڤرا کونکونکەین
هەتاڤێ سەرەو ژێر و دووراتیا گەرد و ستێرا سەروبنکەین
هەڤالا تە هەلبەستا من یا پیرۆزە
گەر بەرزە بووی وێنەیێن من تاری دبن
ئەڤ ئاسۆیا هۆ بەردیای هەمی تۆزە
رستەیێن من ژراڤەو رامانا هاڤی دبن
لێ ئەز و تو نە هزرەکا ئەفسانەینە
نە تەنهایی دشێت رێیا ل مە دابڕیت
نە ئەڤ شەڤە دشێت ژۆرا من داگریت
تو لبن مژیلانکێن من رۆژی، وێنەک ژ ئەشقا سەرخوەشی
ئەز یێ دهێم و تۆژی وەرە ل سەر پەیڤێن بای
دا تەنها بوونێ سەرژێ کەین
ئەگەرا دارا گەهشتنا مە تەڤدا شین بوو
هەر بەرهەمێ پێڤە بێتن ئەم دێ ژێکەین
تو ل چی عەڤرێ سوار دبی هەما وەرە
تو ل چی کەڤرێ سوار دبی رێشاندەرە

**٩/١١/١٩٩٧ئەلمانیا-هەلبەرشتاد**

رێ و رێ

رێ و پەرێ رێ

هەمی رێنە و رێ دچن سەر رێ

هەمی رێنە و رێ دچن ژ رێ

نالێ من د رۆژنامان دا نەنڤیسن

ل پشتی رێ، رێ پرسەک بوو

دناڤ جزدانکا من یا رەش دا ببوو وێنەک کاریکاتێر

سوبە و دوسبە و هندەک خەونێن من ل بەربوو

بنەڤشی بکەم، ببوونە پێر-خوە د پەرێسن

ل کوژیەک زرالێ سەرێ رێ، رێ ببوو مار

ل هندەک پارچا رێڤەچوونا ل سەرماری بەرەف کووریێ
ل هندەک سەمتا ببوو ڕۆبار
پێدا چوونا بڕۆباران دا ژ کەناری بەرەف کووریێ
لێ دیسان رێ بەرەف تە دهات، دا بگەهمە رێ
هەمی رێیەک دچیتە رۆما و هەرجار رۆما یا ل پەرێ رێ
لێ هەر ترسەک شرینیەکە و هەر قۆناغەک پارچەیەکە ژ پەیکەرێ رێ
ئەز ل پشت خوە ناڤەگەڕم
ئەو وێنێ مای ل سەر پارچا رێ من بێ دۆتی
ئەو پەرتۆکا ژ چاخێ زەربووی من یا کۆتی
ئەو هۆزانا بوویە سترانا بەژنا رێ من یا گۆتی
لێ ئەو چاڤێن بووین سەنتەرێ رێ...
چامەکا من یا نە نڤێسی بوو و چیرۆکا بێ رێبەرێ رێ
هەمی رێیەک راستییەکە، لێ سەروبن خوڕ درەون
هەمی رێ دچنە سەر ئێک بێ سەروبن، چو دوماهی ژ رێ را نینن
هەمی گەردوون هەر رێیەکە
کالێ سێریانێ خەونەکا ئێڤەلی بوو، من وێ جارێ ل پەرێ رێ دیت
ببو تەڤنپیرکەک مەزن، دەستێن خوە ل هەمی تایێن رێ وەرپێچابوون
ئەو رێکا هە بسێ هەیڤا دچیت، هات و باتە و کۆسووڤۆیە
ئەو رێکا هە بسێ لیرایە و بتەنێ باسکێن ئەسپانیا دشێن ڤی پارەی بدەن

چوونکی خەونا وان نەهاتە پەژراندن
ئەو رێکا دی ب هندەک سالێن بێ هژمارە و
ترکستانا بەلکانێ یە و خەونا سولتانی یا داهاتە
رێ دچن سەر رێ و رێ دچن ژ رێ
نەچە شامێ و شام شەکرە، دێ تو هێیە فرۆتنێ ببەهایەکی کێم
نەچە رۆمێ و رۆم ئاگرە، دێ تو هێیە گرۆتنێ راستی دبێم
نەچە تاران-دێ تو هێیە خاپاندنێ
پسمامینی حاجیرەشک و رەشوێلەیە، دێ خەونا تە مینیتە دێم.

١٩٩٩/٨/١٥ دهۆک

ل بەردەرگەهێ سمفۆنیا من یا نەڤرۆکە پارچەکرنا خەمێن رویتە
خوەزی یارێ! تە ئەز و ئەڤ هەلبەستا من ژ بیر نەکربایین
ژ بەر کو ئەز ب هیڤی مە تە دروومەتا ڤێ هەلبەستا خوەدا ب چینم
تو ب رۆندکێن کەنی و کەربێ دلێن پەیکەر ئاراڤ دکەی
ئەز ب دلۆڤانی نەینۆکێن تەی بوویەکری د پەرخینم
پەیڤێن ب ئاڤران مەستبووی/پێنجوکانێ و یاریا ب رامانێ دکەن
رۆندکا ژ دەهمەنێ دگرن، تافیردکەن
بارەک گران و رامانەک گەلەک بچووک
بارەک سڤک و رامانەک دوور و درێژ
گووینێن هەلبەستا من خێڤێ ژ تالانێ دکەن
پەسارێ ئاڤروییەکا تە یا بەزەک/ رۆبارەک هیڤیێن هەبوونێ برێ دکەن
دو گرنژینێن ژ درەو.. خاڤ ژ لێڤێن تە چێدکەن

دلبەرا من، تو د مەندیلا من دا چاڤ چریسک و لێڤ پەپولەی
تۆتیا ل سەر شووشێن گولاڤا خاڤکرنێ
وێهەنێ باخێ ئیرەمێ دچاڤێن/مەدا/یێ نڤستی
بەس ئاڤرێن خاپاندنێ تو بدە من... وێهە کەسێ من یێ شەیدا،
د نهێنییێن چاڤێن تە دا، دسیبەرا ڤیانا تەدا بوویە مەستی
من دڤێت پەیڤا ژ رۆندکێن تە را سەرخوەش بکەم
ب پرزکێن سەرێ ئەزمانێ خوە سۆراڤێ ژ لێڤێت تە ب رەنم
دا دچیاییێن بیرێن تە دا نەبم باهۆزەکا بەفرا ژ کین و پەشێمانییێ رستی
ل سەر پەرێن رۆمانا سۆزێن بێ سۆزان
چریسەتا چەرخێ وەکهەڤیا مارکرنێ/
ل دادگەها مزگەفتەکا حزبایەتی دەڤێ ل پەیڤا مەیخوەر بەستی
«ساقی تو ژ بۆ خودێ کەرەمکە..»
دەڤێ من و رۆندکەکا کریستال ب گەهینە ئێک
پارچە مەزیکەک (مۆزارتی) ل یاریگەهەک بەرشەلونی
بۆ من و ڤێ کچکا شووشەی بکەن دیاری
پەیکەرێ مە د شانۆگەریا سلبوون ژ ئاوازێن رۆکی دا چێکەن ژ هەستی
بەردەرگەهێ تەماشکەها پەیکەرێن مە دێ ژ خزما یاخی بیتێ
دا ئەز و پەیڤ د ئێک ب گەهین دڤێت رامانێت خوە ژ بیر بکەین
تا لێڤێن من رستکێن رۆندکێن تە ب هەژمێرن/
ڤێت تامی ئاڤا سوور بکەین
پۆسیدە نەبە/ رۆندکێن یارێ/ ل پەیڤێن گووڤەند وزێماری

سەرخوەش دکەن پەیڤێن هەلبەستا ئێڤارێ
ئەز د ئازرینا هەستێن خوەدا، تو د زڤرینا کەرب و کینا مەستێن خوەدا،
دو پەیکەرێن ژ ئێک رامانێ دروست دکەین؛
پەیکەرێ من.. دو پێن بەفرێ و سەبەتەکا ئەفسانەیی
ژ چێکرنا کومپیوتەری/
سەرەک پرێ کەڤال و خیچێن ئەنتیکە
سۆرگولێن گوند و گووڤەندا سەگلاوینە، خورنیفکێن تازە هونەرمەند،
سازا خاپاندنێ پێکە
پەیکەرێ تە... دو پێن ژ تیرکێن هەتاڤێ و سەبەتەکا ژ تلستارێ
ڤەگوهاستی/
سەرەک تەڤدا خەونێن مژدار
ئەڤیندارێن بووینە نالبەند، شاعرێن بووینە هنربەند،
ستێرکا رەڤاندنێ تیکە
ئەز نزانم ئەڤ پەیڤێن هە بۆ دگەل من ناکەن سەمایێ
سەرێ مانشێتێ رۆژنامێ یێ د بەرویکا پارکەران دا،
ژ بیرکرنێ رەنگەکی ترسنۆک دایێ
هەی! ئەوا تو ل بەرامبەر من رۆندکێن کینێ د بارینی
تبلێن من شەکرنا پرچا تە یێن ژ بیرکرین
ل پشت لێڤێن تە جۆت.. جۆت رۆندک همبێزکرن/ب ئەڤینی
ئەی شەڤا خەونا من دادای سەر مەمکێ تە/
د شووشەکا گولاڤێ دا تە مەرگێ من پاوان دکر/

ل بن مانشێتێ رۆژنامێ

«مەی نەنوشی شێخێ سەنعانی غەلەت»

ل گولستانا نوونەرا چپکێن خوناڤێ مەست دبن پەیڤێن هەلامەت

وێنەیێن ناڤ هەلبەستا من ژ مەبەستا من یاخی دبن

دێ وەرە دناڤ دلێ من دا/مەستی گەردوونەک بچووکە

ل پشت دیوارێن ئارامبوونێ

دەستێن دلۆڤانیا من پرتێن کینێ ل سەر رانێن تە دکرن بابەت

رەندە بێژم من ئارهانا تە ئارامکر

ب هەلبەستەک کەفتی بەر ژانێن سەروایێ

نۆکە تو پەسنێن یارێ خوە و ئەز کوشتنا هەڤالێ خوە دێ

دەستپێکەین/

نەچاڤێن تە سەخبێریا روندکا دکەن...

لێ تبلێن من ژ سمفونیا هاڤیبوونا میرنشینێ تۆرە دبن

«تۆرە نەبە.. تۆرە نەبە.. تۆرە نەبە»

هێشتا تیپێن وێ نامەیا من نەڤێتێ بنڤێسم هشک نەبووینە/

د سوژن د هەستپێکرنا من دا خور دەرامەت

دەنگێ دەفێ ژ دوور نایێ

**١٩٩٦/٦/١٦ دهۆک**

# سەرما دهات و گولەک
# ژی د بشکڤی

گولەک ب تەنێ د ئاشۆیا من دا شین ببوو
من نە دڤییا هەڤڕک ژێرا پەیدا ببن
سلاڤێن گەرم دلاندکا سەرمایێ دا مەزن دکر
دا بکارم حەزکرنێن خوە ب گولاڤا وێ ئاراڤ بکەم
ئەو کچکا ناڤێ وێ هێلگا
ل سەر تبلا حەزکرنێن خوە دبای پێچابوون
دا کەسێن بێ یار و تەنها
گۆڕێن خوە د ناڤ ڤینا گولێن جوان و دووریێ دا دکوولن
پێرا شەیدا ببن، گەلەک کلی د چاڤان دا پالڤەدا بوو

د ڕۆبارێن دیتنا من دا جوانی د کوشتن
ژ بووی کەهیکرنا هەستێن هۆڤ بوون دارستانەک تاری
دناڤ پرچا خوەیا زەردا قەتران دابوو شووستن
د ناڤ پەنجێن سەرمایێ دا ببوو گوژیشک
ب نێرینێن ژ هایچوویێن من دکر کەنی
هەر چونەبیت ئەڤێ کەنیا وەک تنگژینا پشیکا
هندەک بەرژەنگێن دووریێ ژ بەرەبەستێن
بێ سەروشوونێن سینگێ من دمالشتن
:-ئەگەر ژ مێژە من ناسکربای
دا بێژمە تە نەبیت کلی ل چاڤێن خوە بدەی!
ئەگەر چاڤێن خوە کل نەدەی، بخوە درەش بان
ئەگەر دێمێ تە ئەسمەر با و
گەردەنا تە ئێک خالا ئەسمانی ل سەر با
حەزکرنێن من دبیت جارا بتە دگەهشتن
بەلێ ژ بۆ من تو نابی نازێ
هەر گاڤەکا من ددیت بێری
یان ژ بووی سیرک و پیتۆکان
ئەم ژ گوندێ مە د چووینە کێری
یا درێژ بوو گەردەنا وێ وەکی قازێ
مراری بوو خوە ڤەدهەژاند

هەکوستریەک بچووک بسەرێ تبلا وێ دکەت
دا ب نازداری ل من کەتە گازی
هەر چاخەکی هندەک هەڤال دگەل مەبان
فهێتییێ ئەم ژ هەڤدو ڤەدەردکرین
ها لوی چاخێ ستریەک بتبلا من یان تبلا وێ دکەت
ب جه دهات ل مە داخوازی
لێ تو تەنها ژیانێ دناڤ دەستێن خوەدا سەر بڕ دکەی
چەند یا جوان بووگوهانێن تە ژ شیری پڕ بان
کودیکەک ل بەر سینگێ تە با و
دناڤ دومانا نڤینێ را داخوازێن تە
هنارە ترشێن پاییزێ و هێشتا کوڕ بان
داحەزێن من، ئەڤێن هەستێن وان ڤەمرین
هزرا سەرشوویێ گەرم کەن، ب تە خوەش بن
دا کولیلکێن ژیانێ دناڤتەدا گەش بن
لێ بویاخێ و تەنهابوونێ تویا ل گومانێ سوار کری
بەلاڤوکێن ب دیواران ڤە ئەز نا خوونم
یان ریکلامە و خاپاندنە، یان پارتەکا سیاسیە
ئارمانجا وێ بتەنێ کورسیک وەرگرتنە
یان زەریەک راکێش سەرنجە
جلکێن جوانێن ل بەر خوە کرین، مەرەم پێ لەش فرۆتنە

ل من ببۆره! ماچێن نه ژدل نزانم ل لێڤێن ته بدەم
دەستێن من ژی هینه بووینه تەنێ ژ بووی ئارامکرنێ
سینگو بەرێن ته تێک ڤەدەم
ئەز یێ گەرم بوویم دناڤ خەونێن بنەفشی ڕا
ب هیڤیەکا شاهانەیی کەڤرێن دیرۆکێ دنەخشینم
تو هەستێن من نه ئازرینه
پشیکێن من ل سەرخەونێن کەسک نڤستینه
ئەڤ وەلاته و سەرادا وی یا سەرمایێ و بێ هەتاڤی
ژنکێن ڤایرۆس ل سەردەهمەنا و ژ جلکا هاڤی
هەستا مرۆڤێ بیانی دهاڤێن ئاڤێ
دا ب بن پەرییێن چیرۆکا و دگەل ماسیا گوهنێلێ بکەن
پەری داڤێن تۆرێ ماچی بکەن
ئێک جار سالێ هێکا بکەن، تو شکەفتەکا بەر ل ژۆری و
ڤێ سەرمایێ لێڤێن ته یێن ڤەکەلاشتین
لێڤێن ته یێن بووینه گرزک... شەرما ته یا بوویه پرزک
رۆیێ ته یێ بوویه درزک
لێ یارا من ڤیانەکه د چاڤێن گوپکێن دارا را دهێت
سترانەکه ب بەرۆژ و نزارا دبێت
هەر جارەکا رۆژ ئێڤاریا خاترا خوه ژ شەدا دخوازیت
دبێژیته کچا خوەیا بچووک دێ بابا هێت

هێژ نێرگزێن مە نەوەریاین ژ گولاڤێ
پچەک لێڤا رۆژێ یا ل دەر
تە دڤێت دووکێل دناڤ پرچا تە بهلاڤێت
دو پشیکێن نیکوتینی رەخێن رەهێن تە دگەزن
جگارا تە یا دناڤ تبلێن تەدا مری
تو ژانددان ل گوریکەک ئاگری دگەری
دا ژ نشکانڤە چاڤێ من و تە ڤێک بکەڤیت
دەستێ من ژی د بەرویکا من دا لێدگەریا
نەک تو بێژی کا ئاگری/ ئەز نزانم
پێحەسیانێن نیکوتینی وەسا بلەز دناڤ خوونا مەدا دبەزن
لێ دیسان ژی تو هەر تەنێ نیکوتێن مای
نە سینگێ تە وەک یێ دەیکا من یێ گەرمە
من ژ ترسا دەورۆبەرا ڤەدحەوینیت
نەحەزکرنا تە کارلێن دکەت، کولیلکێن مۆر و پیڤازی
دناڤ خەونێن من دا ب چینیت
نەچاڤێن تە وەک یێن خوەشکا من درەشن
بۆ من حەزا نێزیکبوونێ پەیدا بکەن
نە لێڤێن تە وەک یێن کابانیا من گەشن
من ل هەستا قوربانیێ شەیدا بکەن
ب تەنێ دکارم سلاڤا تە ب دۆستانی ل تە ڤەگێرم

کۆچکا ب پاڤێ من تەڤ چاخان تەژی دۆست بوو
دوستانی یا د چاڤێن من دا هاتی چاندن، نا گوهێرم
لێ زێدەتر هێرڤە نەهی گۆرخانەیە
خور کولیلکێن ئەز حەز ژێ دکەم بێهن کەهینە
من یێن ل باخچەک ب تەنێ چاندین
پسیارێن خوە دو جار نەکە، بەرسڤێن من تێژک نابن
چو نهێنییێن ئەز ژێ کووڤی نا ڤەشێرم
ئاو ڤی دەرزێ، ل تەنێ ل قوربانی یێ ئەز فێرم

چوونه ماهوو یان ئەز، یان تو دا حەلینە د کەسێ دیدا
ئەم هەردوو دا بینە کەسەک
ئەڤ قۆناغە د سۆفیاتیێ دا بلندترین رەڤشتا هەستەک پاکژە
د هەستپێکرنەک جادوویی دا ئەز ب بوومە پیرهەڤۆک و
من حەز دکر ب تەنێ ئێک ژ مە ب مینیت
تو ب مینە و ئەز دێ حەلییێم
ئەز ب مینم و تو ب حەلییێ/ لێ ژۆرا من یا ب مژە
تو چووی، ... هەر ژ پێنگاڤا تەیا تاری
خەونێن من بەرۆڤاژی سواربوون، ل نڤێژا من یا مێروو
سیبەرا تە وەک گورگەکی ل خەریبیا من دنێری
ترسە/ بایەک دژوار یێ دهێت
خەونەکا من ل سەر پێلێن بای/ بارانەکا ستۆخوار ژێ دهێت

ئەز ل پەرەکی سپی دگەرِم دا لێ سوار بم
خوە کێمدیتێ شیان کوژە
ل بن لێڤا دوشەکا من شارستانی وا گەهشتی
بچووکترین شیانا خوە دکەمە گەشتی
نۆکە هەکو ل بلنداهیێ کەچا ئەسمانی ب ئازریت
پاشی رەشی داوەشیتە سەر عەڤران
ستێرەکا سل ژ ئەشقا رۆژێ ببیت هەلم
سیبەرا خوە ئەوا چاڤزەر د رەنگێ خوە یێ ئاسایی دا دێ ڤەشێری
تو چووی، ... خەونێن من ژی هاتن
ل سەر نەرمیا هەستپێکرنێ د پەلجێن بەرزە بوونێ ئالیان
عەڤرێ هەنێ یێ بووی دۆلاڤ/ زڤرۆکەک پێش، ئێک بەرەف پاش
ئەڤ سوپەیا ل بەرسینگێ من، چەند بێهەتکە و تێهنێ نادەت
ئەڤ کۆڤارا ل بەردەستێ من، چەند بێدەنگە و بێهنێ نادەت
پێشییێ ل خەونا من بگرە و وەرە بهاڤا سەرژێکەین
ل من نەگرە، ئەڤە د سەرداچوونەک مەستە
سۆفی ل ئەڤێ خالێ دمینێ شاش
توو چووی، ... دارا سەربۆرێن کەڤنارە یا دزڤرۆکەک خاپینۆکدا
ئەڤ ژۆرە یا د بێدەنگییەک هناری دا قنارە بووی
ئەز یێ دهێم و خەونا من یا دبازبەندەک ژەنگاری دا غەوارە بووی
ل سەر پرچا بای، من دڤێت بێنا چیا ڤەکەم
من تو دڤێی هەما هۆسا، ب ڤان سۆزێن تەی خاپینۆک

دێ بیرهاتنێن تەیێن ئەڤرۆ کەم پیرهەڤۆک
ئەو شکەفتا هە، هەلما ژ دفنا وێ دەردکەڤیت
پیرەمێرێ هەی ئەرزنک تیژ، دۆلفێن ژ گوهێن وی دەردکەڤن
ئەرێ، تو دزانی من خوە ژ بیرکر..!
ئەینۆکێن من یێن بووینە دێر، ددانێن من یێن بووینە کێر
دا ئەڤ شەڤە د تۆزکەڤسکێن هۆڤیتیێ دا
هەستیکێن وی بکەینە مێویژ
ل سەر ڤەکوشتنا هەستا بکەینە شەڤبێر
تو چووی،... ئەز هەست دکەم نوکە تویا ل سەر دەهمەنا کولانا مەی
سەر چاڤێن تە یێن بچووک بووین، ها نێزیکە دێ هندا بی
من نەڤێتن هێشتا بەرێن بنسترا کەلهێ راکەم
نەک نهێنێن پیرەژنا ب هەلێڤرم
یان تو ب نڤەک مەکناتیزی بێ های ببی
ئەز دبێژم ئەڤە هەمی خەونێن سۆرن
وێ رۆژا هە دناڤ پرچا بایەک سۆردا تو پشکەکا گۆشتێ خاڤبووی
ل بەر کنارێ شەڤەک دەستپێکا رەشمەهێ ئەز گیڤرم
ل سەر کولیلکەک هێرۆیێ ب ترس چاڤێن خوە دگرم
تو چووی،... ئەز هەست دکەم نۆکە تویا ل بەردەرگەهی
پالتۆیێ خوە ددەیە ئێک، گلیزانکێن پۆشمانیێ
د پێنگاڤێن تە دهلنگڤن
کا رووینە خوار، دەنگێ مارشێن لەشکەری یێن ل سەر چارلەپکا

ئەو زەلامێن هەی دناڤ مژیلانکێن بەفرێ را
تبلێن وان وێ ل سەر جەلەبکا
هاڤیبوونە، ب ترس ل سیتاڤکێن خوە دنێرن
هەچکو کرم، بچووک دبن، بچووک دبن، ل سەر کوولاڤێن خوە دنڤن
توو چووی،... ئەز هەست دکەم نۆکە تویا دخودیکا تاریێ دا
چاڤێن خوە بکۆڤانا کلددەی
بۆریێ تە یێ لەوتی د ئاشۆپا تە دا دنڤیت
دهێت بیرا تە هەکو مەمکێ تە بوویە چوینگ
تە نان ژ هەژارا ڤەشارتی و بوویە مەیوینک
تە شیرێ (پوتانا) ڤەخوار/ تو مری و رابوویەڤە مار
لێ کەهی بووی، د شەڤێن سارێن دەریایێ دا
تو بوویە مژ، ل دارستانێ تو هاتی خوار
دا ب جوانیا نێرگزەکێ سەری هەلدەی

١٩٩٧/٤/١٥ دهۆک

# رێپیڤانەک
# د حەزێن مەدا

شەڤە و من و تە ژڤانە، رێپیڤانەکێ د حەزێن خوەدا بکەین
خەونێن ئێک دو ڤەخوون و ب تبلا نەکەڤین چاڤێن ئێک و دو
د سویلاڤان دا نەفڕین و د ئارۆنکێن بێ هشیا خوە دا نەگرین
مەمکێن ڤیانەکا نەمر ب مێژین
بدەستمالا سترانا خوە بدەینە نیاسین
پشتێ هنگێ دێ هێڤکەینە پێلاڤێن خوە، نە گرنگە چ رویدا بوو!
نە پرسە...!!
هەر کەسی کەمانچەکێ بدەتە من، دێ لاڤژەکێ بۆ کەم دیاری
شەڤە و من و تە ژڤانە، نەنڤین،

دا خەونێن نەهشیێ مە بەرەڤ دۆژەهێ نەبن
وەرە دا ل بێدەنگی یێ سوار بین و
گۆرەکێ ژ بۆ بێ ئومێدیێ بکۆلین و پلانەکێ ل دژی کینێ داریژین
شەڤە و من و تە ژڤانە راستیا نە ڤەشێرین
تو ئەوا کو حەزێن من ب تە دژین
کاکلکا ڤیانا من بکە کراس و تەنورەی ژ پیستێ من بدوری
ئەو خەونا کو تو ژ من جودا بووی
هەرە! دوور.. دوور هەتا تە بڤێت هەرە
ئەی خەونا تە نیڤەک من ب خوەرا بری
هەرە! بلند- بلند هەتا تە بڤێت هەرە
ئەز ل بلندی یا نا ترسم هزرێن من پەیسکن
تم ل دووراتیا نێزیکم، هەستێن من چریسک
من و تە ژڤانە مرنا پەیمانا ژبیر بکەین
پێژانێ باوەریێ نە سوژین، ل کەندا نە راوەستین و بلند بفرین
ئەم دێ ل هەستێن سۆر سوار بین و چین
هەتا ب گوریا ئاگری نە کوزرین
ئەز هێشتا د وێ ڤیانا تە بۆ من هێلای دا شین دبم
هشا من بەخچەیەک هۆڤی و گولێن رەنگ رەنگە
سرۆدەک گولاڤێن مەست بۆ دژەنیت
تو بێژی ئەز ژ بەر کەنیا تە هاربیم
ژ کەلا هزرێن خوەیێن بلند بێمە خوار

ل داربەستا حەزکرنێن خوە سوار ببم
جارەکا دی بەرەڤ گرنژینەکا بچووک
ژ بلندی یا چیایێ ئومێدا بدمە رێ
ئەڤە و من و تە ژڤانە، ل جهێ فەلەک/ ل هەسپێ خوە یێ رکێ سوارە
بێهنا پەلاتینکا و بەبووینێن ئاڤرمووشی دهلچنیت
گول ب ئاڤێ ساخ دمینن و سینگێ تە شەرگەها نیڤرۆیەکا چلەدارە
دو چیکێن خوها من لڤینەکێ پەیدا دکەن
گوهێ خوە بدێ دەنگەکێ دهێت
نە ئاریانا چەپەرایە و نەژی تڤەنگێن داوەتیا
نەلێدانا دەرگەهی یە و نە پێدادانا بەندی یا
بەلێ دلێ منە ژ بەر ڤیانا تە خوە ڤەدقوتیت
من و تە ژڤانە د بهاڤێن کورت دا
وەک شەڤەک رەش و سۆتنا چرای پەلاتینک دهێنە ئاگرێ
ئەو بێهنا ڤیانا منە
چو نکی پەرستنا من پەرگرافەک ڤەشارتیە
سۆز ئەز و تو پێ دزانین
ئەز حەزناکەم ئێڤاری بهێن پەلاتینک لێ شەپرەزەدبن
ئەز حەز ناکەم نشیڤی بهێن دا رێک ل تە کورە نەبن
هەر ئێڤاریا ئەگەر ژ بەر پەلاتینکا نەبا
دا هەلبەستەک خوە سوژم، دا تاری مریا
هەر سپێدەیا دا بەرێ تە دەم چیایەکی

دا من هزرا نشیڤ بوونێ ژنک تە بریا
من ب ستێرکا نێچیرڤانا ترس ل دێمێ تە هنگافتبا
من نەڤێت هزرێن بچووک ب چینی
من نەڤێت هەر ژ نۆکە خەونێن مەزن ب بینی
ئەگەر پەسار ناڤکرنەکا ئەڤسانە بان، خوها من دا گەردێ پرکەت
لێ هێشتا رێ هەر پەسارە و ئەینۆکێن رێ سەرهاتیێن ئەفیون خوەرن
من چوجار تو ژ بیر نەکربووی
ئەگەر تو ل کومتێ پەساری ڤەشارتی بای
دا پرچا تە بیتە هەڤالا بای
هەمی تشتەک تێهنی دبیت د بیابانا حەزا تەدا
ب تەنێ ئەز یێ بوویم کمکمە، گەرماتیا پاشڤە مایێن تە ڤەدخوم و
ل بلندی یا حەسارۆستی بەنگێ دکێشم
(نازک و نازدار و رەندە دەلالا من
ئەو شرینا بوویە گەزۆ ل سەر لێڤێن من) ئەز دەروێشم
((مەی ئەنوشی شێخێ سەنعانی خەلەت))
سووچێ من نەبوو کو من حەژ تە کر، هەر ئێک چەرکە بوو
توفانا ڤیانا تە ب سەر من دا هاتی
دارێن باوەریێ بوونە گەمی داکو نەمرم
ئەفسانەکە ئەگەر تو ب خوە باوەربکەی
ب تنێ ڤیانا ئودیسیوسی و مەزناتیا ئوکیانۆسی
دشێن ئافراندنەک وەساچێکەن

سووچێ تە نەبوو کو تە ئەز هێلایم
بلا دووراتیا مە ئێک بهۆست ژی بیت
پێن من هەسپێن باینە و چاڤێن من باگیرێن لاغەر
دێ پیڤانا کیشوەرا کەم و سەرادانا دۆژەهێ خەونا منە
تو سەلوایی، ئەو پشیکا ل سەر لەوەندی یا دا پیرا من،
بێ ترس د خەو دچوو
تو ئەو بایی، هەرجار سها من پف ددا
بەرەف جیهانەکا ڤەبووی... جار دی دچوو.. دچوو.. دچوو
هەتا بسکێن داپیرێ د هەژاندن و سەما پێدکر
تو ئەو شکەفت بووی، ئەز و داپیر و پشیکەک، ئەز و ئەیلۆل و خوزیکەک
ئارام...ئارام د پاخلێن چیایی دا رازاین
چاردە چەرخا د نەهشی یا ڤیانێ دا
مە گیانێ برسێ د خوار، مە ترس کربوو کالکەک چەرمی
ئاڤ بەفرێ، ل سەر گەرمێ ئەم برێڤە دچووین
بیرا خوە بینەڤە، مە ژڤان دا بوو هێشتاپەیمانا مە گەرم
هێشتا تەڕاتیا شکەفتێ بهەستێن مەڤە
هندی کو مەژیێ مەیێ رزگار
هندی کو مەژیێ مە یێ رزگار، هندی ئەم قورتال بووی ژ خەونێن هەڕفتی
مە کوژیێن شکەفتێ ماچی دکرن و بەرویکێن مە د تەژی ئومێد بوون

. پرچا شەڤێن تاری دا، دبن بۆمبا و ناپالان دا
ێول گەش دبوون و پەلاتینک ژی دفڕین
بووچکا هێلین چێدکرن و زارۆک ژی دگرین
ەفر هەر ل چاخێ خوە دباری و بەهارێ گەنم شین دبوو
ەر چەوابوو، سترانا مە ژ بۆ ئازادیێ دهاتە گوتن
ەونێن مە بچووک دەست پێکرن
ەزن دبن و بدوماهی نەهاتنە
ەم دێ کەڤرەکێ دی ژی ل بێدەنگییێ دەین
لا بێ دەنگی بیتە شکاندن و سنۆر بێ رووەمەت ب مینن
اش ئەز و تو و جزیری و سەلما دێ بین بووک و زاڤا
ووماهیکەکێ بۆ دەستپێکا خەونا دانین
ە ئارامی و سەربەستی دڤێت

من کچەکا هەی بچووکە، هەکو دناریێت، دڕندەیەکە، پشیکە
کو نازداریا ژ بۆ من دکەت، د دەستێن من دا بووکە، لاستیکە
من گۆت: دێ چم سەر گۆڕا بارزانی
گۆت:باڤۆ مادێ تە بینیت؟
من گۆت: بەلێ، یان ژی ئەرێ
گۆت: باب دەستێ وی ماچیکە
ئەوێ ژ بیرکر، لێ وێ شەڤێ ئەز د جەزبە چووم
هەتا تبلا هەڤالێ من بوویە زەنگ و
دەگنڤەدانێ دیوارێ خەونێ کر تیکە
ئەها نۆکە هەموو تشتەک پاکژ دبیت
ئەز نوکە تەڤدا روومەتم، ئەز یێ دهێم و دناڤ سترانا نڤستنێ دا
بازێڕ ل ملێن دەمهەژمێرێ سوارە

چاخی بەرەف پێش دکێشیت
کوڤمێرویێن پرتەقالی ژ دفنێن باژێری دهێنە دەر
بهاڤێن باخی دکڤێشیت
نۆکە ل سەمتا قۆناغا من ئەلند گەلەک یا ڤباکەتی
ل ناف داڤێن پرچا چیایێ ئارامێ
پرتێن ئاڤێ ویێن هەتاڤێ نێرامێ دبن
دوژدانا من دا زەردەشتە راکەتی
ل سەر زنارێن دلێ من ملیۆن شەهید دبن هەلامەت
بەرێکانێ دکەن، دگەل سۆفیێن دناف ژڤانێن ئەڤینێ ڕا
بووینە مەیگێرێن ب روومەت، روو دکەنە ناڤپێکا لەزێ
هەستا من یا دبن ژانێن هەلبەستەکێ ڤە دنێشیت
ئەڤ سپێدەیا ئەز دچاڤێن هەتاڤێ دا بوویە دەرگەه
ئەز یێ دهێم و، ل سەر پێیا و سەر نشیڤم
چەرخا چاڤێن دەمهەژمێرێ دکڤێشم
درۆباران دا دخەنقینم نابیتە دەه
کوور ترین سالا بیرکرنێ چرکەیەکە
دبیرێن من دا هەمی تشتێ ڤی وەلاتی دبیتە مەرگەه
ئەز نۆکە یێ بوویە تیرۆژەک هەتاڤێ و چاخی دپیڤم
ئەز یێ دهێم و من چل ملیۆن مەرگێن ئەفسانەیی ب خوەرا شاندن
من چل پەرداخ مەی شکاندن

هەمی خەونێن ل پەرێسگەها تە هەی چاندن
دناڤ ئەسمانێ هەلبەستێ دا ئەز شەرم دکەم ل تە ب نێڕم
چوونکی هێشتا دپاناڤا خەونا من دا
ب کۆلکێن ساڤا ئەز دزانم، لێ خانییێن کاڤل نە باوەرە ب شێم ب هەژمێرم
ئەز یێ دهێم و سپێدە ل باژێڕێ من رەندە
کەت و ماتێن پێکەڤێن تە مەستێ پێشمەرگەهـ
ئەی چرایێ شەڤا رەشا کورد ڤەخوارین
دبن مژیلانکێن غوربەتێ را، تو ب کول و خەمڤە رازای
تەڤا هیڤییێن باڤێ من درەنجی بوونێ دا چرمسین
ژ وان خەمێن بووینە بەفر
بەرامبەر تە هەستپێکرنا من یا هەژیای
هندی دهێمێ مژیلانکێن من ئێک بەرنادەن
ستۆیێ من یێ بوویە گۆپال
چیایێ شرین یێ ژکەفێ زای
دفنا من یا ب سینگێ من ڤە بوویە دۆژەهـ
ژ شەرما رۆییێن من قەڕسین
دپرسێن چار دەولەتا دا بوونە زالگەهـ
ئەز یێ دهێم و هەر چرکەکێ هندەک ژ بهاڤێ دمریت
ڕۆبارێ (زێ) پرتێن سلاڤێ وەردگریت

چو نەمایە ئەز و ملێن دەمهژمێرێ هنگافتنا چاخی بکەین
د ڤەخوارنا پیرۆزیێ دا سەرهلدانا تەیێ پیرۆز
دەستێن من و سەرێ من و هەر ئەندامەکێ لەشێ من یێ بوویە سۆز
... ئەز و ئەڤە خەونا بەرفرەهـ وەلاتەک رەنگێن هەڤدۆز
پەیکەرێ تە دکەینە قویبلەهـ
ژ باکۆر دهێم و سەرێ من ئاگرە
ژ پاشورڕ دهێم و سینگێ من بابە گورگورڕە
ژ رۆژهەلات دیلمان دچاڤێن (سمکۆ)ی دا خوراگرە
ژ رۆژئاڤا هەردوو دەستێن من ڤەگرە
داد بهاڤێن ئازادیێ دا مەزارێ تە بکەینە پەرێسگەهـ

٢٠/٨/١٩٩٦ دهۆک

# چریسکێن
# ترس و ڤیانێ

هەڤالا من پشیکەک بوو، هەستکرنا من وەردگەڕاندە یاریکرنێ
و چاک هی ببوو ماچیکرنێ، چاڤێن وێ دوکانی بوون
ل ئێڤاری یا، ل هەتاڤزەرکێ دگەریان
لێڤێن وێ دوهاڤی بوون، سپێدە زوو یا ژ گەرکێ دوەریان
هەکو مرۆڤ د هەلنگڤیت، هەموو هەستپێکەرەک دلڤیت
هۆ ئەوا تو پەپۆلە بووی، پشیکەکا نەرمۆلە بووی
ل چاخێ مەستبوونا ئاوازێ، هێژ ئەفسانەیا ئەشقێ و شاهیا گولا و..
ئەڤ هەستا من نە ئاشووپەک گووڤەندی یە و
نەژی زرنایەک بێ دەستۆیر

ئەز پەنجەرا ل تاق ناهێلم، بایێ باشۆر خیزی د ئینیت
خەون ل باژۆر گزی دبینیت
هندەک جاران مرۆڤ هەست ب ترسێ دکەت
دبن سیبەرا خەونێن مۆردا دنڤینیت. ئەڤ کدیبابا فالڤەکەر...
دوهی ل سەر لێڤا «راین»ی فالا من بێ یاسا شکاند و
ئۆ هەستا من بریندار کر
نۆکە ل چاخێ درەڤش راموسکرنێ، هەستا وێران بوونێ راکر
مرۆڤ ب هشەک پاراسایکولۆژی، دووکێلا جگارێ د کەتە خودیک
دگەهیتە دوورترین دووریا هەبوونێ
سلاڤ، هەڤالا من دیسان سلاڤ.. ژ کەنارێ (سین) بۆ لێڤا زێ
ئەز هزردکەم ڕۆبارێ زێ گیانەکی ئەفسانەیە/
و مەم و زین هۆنەرەک پیرۆز
سەلکەک رەنگ.. رەنگ ژ بەلگێن دیجلەی
ل بەرملێ زەمبیلفرۆشی ل دەرێ مالا دهێت
تە، گەلەک دۆز دگەل تاریێ هەبوون
وێ شەمالکێ خوەکر خوارن ژ بۆ ئاگری
ئەز یێ تەنها و بێ کومپیوتەر، ب تەنێ ئەز و ئاگر د ژیایین
ئاگر خوارنا گیانێ وی شەمالکێ، ئەز بگێرانا مزگینییێن فالکێ
ل سەر دو برێن بێ هوش دچووین
خوەش هەرخوەش بۆن نەخوەش دخوەش

ڕەش دگەش بوون گەش ژی دگەش بوون
هندی دلەرزین تیلێن سازێ
چایکۆڤسکی! کولیلکێن بووینە سەماکەر
کەمانا تە یا بوویە بەنگ
مەزیک و تاڤیەک بارانێ، ل تیهنی بوونا من دبارن
هەر ژۆرەکا هاتی یە ئاڤاکرن
ئەز دشێم ب دو چاڤان لێ ب نێڕم
ژ ئالیێ ئەهریمەن ڤە دبیتە زیندانەکا گرتی
و سنۆرا ل بەر من چێ دکەت
ژ ئالیێ ئاهۆرایڤە د بیتە پەناکەهـ و نهانی، ئەز خوە تێدا د ڤەشێرم
لەورا دیتنا من تێکهەلوکە، سمفۆنیا شەڤەک شارەزادی یا گەڕۆکە
هەرجار من دگۆت بلا هەتاڤ خوە نیشا نێرگزان بدەت
وەرارێ دکەن، حەز ناکەم بەلگێن وان زەربن
بەری هەتاڤەک نیڤرۆیی بێهنێ بەرددەن
گیا ب ئاڤێ و هەتاڤێ دژیت
«هەر زیانەک ل هەمبەری سۆدەکێ یە
هەر ئازرینەک سەر ئەنجامێ کۆتەکێ یە»
سەرێ خوە ل سەر چۆکا من دانە
ئەز ژی دێ چۆکا خوە ل بەر سەرێ تە دانم
داکۆ چەپەر نەهێن بەردان.. بلا گولاڤ چورەنگێن سۆر نەدەن

ئەم دێ کفنەکی ژ بۆ مرنێ چێکەین و گۆڕەکی ژ بۆ کینێ کۆلین
مۆرترین چرکەیێن ژیانێ دبێ دەنگی و و ئارامیەک پیڤازی دا
دگەل دلبەرێ و د ئاشۆپەک هناری دا گەش ب فڕێت
کو پاشبەندێن سەربەستیەک بێ سنور دبینم
ئەز چو هایداری یان نادەم، دا کەس یا دلێ من ژێ نەزانیت
ئەڤە ژ چاخێ تو پشیک، حەژێکرنا من ب تەنێ یە
هەتا کو ئەز حەز ژ تە ب تەنێ بکەم
دا ئەڤ نهێنی یە ل نک من ب تەنێ ڤەشارتی بیت
چونکی حەز ژێکرن ژلایەکی ب تەنێ ژی دهێتە کرن
چو گوهۆرین دمرنێ ژی ناهێت کرن
کفن رەش بیت، وەک گولێ گەش بیت
بۆ پێچانا مریەکی یە و مری ب هەش بیت
هەر کەسێ نهێن نەبن، ڤەشار نەبن، نە ژ کۆمارا من یا زێندی یە
هەر چەندە خوەشترین تامە،
تو دگەل باوەر پێکریەکی راز و نهێنا خوە دەرکەی
چاڤێن تە دیەنن، چیمەنن، گول تێدا مەست دبن و ئەز یێ شەیدا
نڤێژەکە من دڤێت د چاڤێن تەدا بکەم
ئۆ ژ پەراستنا خودێ ژی دوورنەکەڤم
ئەز دترسم و ئەز حەز ژ تەژی دکەم
نڤێژەکە، ئەز ب تەنێ بکەم ژ ڤیانا تەیە و

ئەز دچاڤێن تەدا بکەم دگەل تەیە

تەنێ ترسەک نینە ئەز دنڤێژا خوەدا ب سەرنەکەڤم -

بۆ کەسێن هەلوەشیای مرن زێرە

لێ مەرج نینە د هەر بازارەکی دا زێر ب بەهابیت

سۆزەکێ بدە من، ماچەکێ بدەمن، کەمانچەکێ بدەمن

ئەگەر ئەز تە چاک ڤەنێرم ژیان رەند دبیت

خەونێن بنەڤشی و ئاشۆپا من یا فرەهـ

دیتنەک گەردوونی یا مەست و ئارام ئاڤادکەن

کەسەک تێدا یێ بەند نەبیت

ب کڤان.. بێ کڤان، ب کڤان.. بێ کڤان

ب تەنێ بەندیبۆنا بێ کڤان و ب کڤان من نەڤێت

جوانترین سەربۆر خەونا عیسۆیە

ل چاخێ پێتڤی بارانەک ب هێت

# گۆتوبێژەک دەروێشانە

**گۆتن:** دڤێت تو خوە ژ بیر نەکەی د سەراڤا دویرکەتنێ دا
تبلا هەڤالێ خوە نەکەی د چاڤێ خوە را
سلاڤ ل ئێڤاریەکا دی، هەکو ئەم کەڤنە سترانێن خوە د جڤینێن
دڤێت تو خوە ژ بیر نەکەی، نە ترسە
دیوارێن مە چاڤ دویکێلن، نابهیزن
ئەو سترانێن مە وێ ئێڤارێ جڤاندین
نە هاتنە پەژراندن، هێشتا درویسن

**تە گۆت:** تو جانێ منی، ئەز هزر دکەم ئەز بتبلێن خوە دزانم
تو مانا منی، گەر راست بیتن پێن من دشێن من هەلگرن
ئەز چاڤەکم-تو رۆناهی.. حەزیکرنێن من تە دنارینن
ئەز ئاڤەکم.. تو ئاڤاهی، رەوانا من هەمی زەبۆنە، ژ تەرا چاڤەنێرە
هەستا من هەمی خوینە، هێشتا تەڕە
ئەز باوەر دکەم گەر تو نەهێی

ل چاخێ باران پێتڤی سترانێن من دمینن ساهی

**من گۆت:** د شەڤێن دویر و درێژدا
تو د تاییێن سار و گەرم دا
گەه د باری و گەه دشنگری و گەه دبویە بەفر
جارەکا دی خوە کوم دکەیە ڤە، دا خەونەکا دی ب تەڤە ببینم
لێ ڤێ گەرێ ژی خەونا من رەش دهێت و
دیوارێ شەڤێ ژی ل سەر مژیلانکێن من دبیتە کەڤر

تە دەنگ نەکر..؟! وان دەنگ نەکر...؟!

**من گۆت:** نە تو د بیبە خەون دا ئەز تە راڤەکەم
نە تو ئاگری و نە خوە را دگری
دا ئەز د شەڤێن تاری دا دووکێلا تە بەربابکەم
ل دووف دەنگ و باسێن سەرابی تو ژینگەهی
لێ برینا تە کوورە و کەنی یا تە دوورە
گری یا تە تیرە و ناهێت بشافتن
نە راڤەکەر و نە رەخنەگر نزانن تو ڤینکەهی

**گۆتن:** هەکو مرۆڤ د کەڤیتە خوربەتێ
د ڤەگێرانێ دا خەونێن وی یێن شرین

ل سەر پشتا سیمەرخی دهێنە بەرزەکرن
دبنە چیرۆکێن ئەفسانە.. کەڤۆکان ژ چیا سل دکەن
خوشترین خەون ل هشیاریێ د هێنە دیتن
لەورا مرۆڤ ژ خەونێن خوە د ترسیت
پێکا دین بوونێ د بیتە چاکترین ژ بیر ڤەچوون و نهانە

**تە گۆت:** نامۆیی بوون د دەریاییێ ژی دا
تاما ئاڤێ دهێتە گوهارتن و ژیان چەتنە
دەور و بەر هەمی بیانی مرۆڤ نە ڤیانی دبینیت
گاڤا گۆتنا مرۆڤی دهێت د بیتە بەر
گاڤا گۆتنا مرۆڤی نە هێت ئەو گاڤ کەتنە

**من گۆت:** د سینگێ مرۆڤی دا دلەک ب تنێ هەیە
ئەوژی ب ماندی بوونێ کزە و دیتنا مرۆڤی لاواز دبیت
چاخێ تو کەڤرێن ئارامێ بشکێنی د بیتە ئاریان
بلا رۆژ ئاڤا نەبیت و چرایان ژی هەل نەکەن
دا پەلاتینک خوە نە سوژن
تەناهی یا پەرێسکەها د هێتە تێکدان و نڤێژ بەروڤاژ دبیت

تە دەنگ نەکر؟! وان دەنگ نەکر؟!

**من گۆت:** چو گۆرین دی بۆ من نه کۆلن
من سەرێ خوە یێ د ناڤ دەستێن خوە دا ڤەشارتی
ب هەر رەنگە ئاوایەکی هەبوونا من چیرۆکەکە
دبیت سوبەهی ژی رۆبدەت
چاخێ مرۆڤی د کاودانێن بەرتەنگ دا
ل قورتال بوونێ دگەڕیت، دا ببیتە پەیکەرێ بزاڤێ
رومەتا من ب پارێزن، تڤەنگان سەر نشیڤ کەن
د چاڤێن قورتال بوونێ دا مرۆڤ خودانێ دیتنەک بەر فرەهـ ترە
چووچکان ژ هێلینێن وان نە فرینن
گەر هشێ مرۆڤی ڤێ نێرینا داخکری وەرنەگریت
ب نێرینەکا دی یا داخبار
بەرەڤ کووراتیی یا سەرێ خوە دێ ڤەگەڕیت

**تە گۆت:** چیرۆکێن هاویشبوونێ بۆ من نەکەنە ستۆڤانک
ل دووڤ گۆتنا دەروێشی مرۆڤێ کورد
کەساتی یا خوە ل مۆزەخانەکێ پاراست بوو.
چاڤێن گامێشا گرێ دەن دا ل تێشکێن خوە ببانن
دەروێشی گۆت لنگێ شیڤای دەرمان نەکەن خوداڤەندە.
پشتی مرۆڤێ کورد کەسانی یا خوە ڤەشارتی
لێ زڤڕین منارەیەک ل سەر شێن ببوو
کەساتی گوهارت بوو و د کەڤناری یا خوە گەڤاست بوو

**گۆتن:** د هەر مێرگەکێ دا رەنگ هەنە و هەمی
ب ژیانێ هاتنە ئافراندن و بۆ جوانی یێ ل کارن

**تە گۆت:** دەنگێ رادیۆیا بلند نەکەن دا خەوا زارۆکان تێک نەچیت
چونکی هەمی هەڤدژ.. نە ب رەنگێ ئەهریمەن و ئاهۆرای د بزڤن
لێ د مێرگا هیڤیێن مەدا هەمی رەنگ بۆ ڤەهێرانا خوەزییێن مە دستارن

**من گۆت:** چو ئاگرێن دی هەل نەکەن
بلا چو پارچێن من یێن دی نەسوژن
ئەگەر ئێدی نا بیتە ساهی و
چو گەرماتی د ناڤ خوینا هەوەژی دا نامینیت
چو ئاڤێن تەزی ژی ب من دا نەکەن
ئەگەر ئێدی باران ناهێن و چیا ژی دێ بنە بیابان و
دەریا ژی لڤینەک نامینیت

**تە گۆت:** ئەز دێ هێم، من ژی حەز دکر تو بهێی
دا بۆ زڤرینەکا دی خوە ئامادەکین

**مێرسی بۆرگ ۱۹۹۸/۱/۱۵**

# ڤیان د چاخێن تاری دا

کولیلکێن تە ژ چرکەیێن بێ هەتاڤێ سلاڤ ناکەن ئێڤاری یا
ئیشەڤ ئاشۆپا من کفنێ بیرهاتنەک بێ دەرگەهـ
ئەگەر هەستەک پیڤازی بیت.. ئەز خاپاندیم
دوهی لێڤێن تە بۆهارا کیڤارێ بوون ل (بادەرەشکێ)
سەرێ سێڤێن تە بومبەیێن نارنجی بوون
د ئێڤارەک بنەڤشی دا ب من ڤە د تەقێن
مەستەک ب تنێ ژ خەونا تە خوداڤەند بوو
گەلەک ژ باخێ تە یێ گەش نەهات چنین
من ئارەزۆ ل سەرکەسێن ل ڤەشارگەهێن بێ دۆز نینە
چرایەک بێ گاز- ل شەڤەک تاری مفای نادەت
گولۆپەک ڤەمریای- بێ پەیوەندی پیرۆز نینە

بەری ئەز، تونێک ناس بکەین ڤە
من روناهیەک دڤێت، ل بەراهیا چاڤێن من
یاریا ل سەر دیمێ تە بکەت
چاوا ژ خوناڤێ د ئافریت،
دا بزانم برووسی ژ قوچانا عەڤرێن گران چاوا درژیت؟
بەری ئەز و تو ئێک هەمبێز بکەین
من دڤێت بێژم تە، کەسکە سۆر سۆزا رۆژێ یە و
برووسی ماچا عەڤرا یە ژ بۆ ڤیانێ
من سۆزەک گەرم..گەرم دڤێت
دا بزانم بەکوی چ پەیمان دگەل میرێ بۆتا هەبوو
دا بزانم ئەو چ خوونە ژ خەنجەرا تاجدین دکەڤیت
ئەڤ رویدانە گەلەک و گەلەک د سینگێ تە دا یا رێڤن بووی
تو شەڤەکێ وکلیلا شەڤێ ئەفسانەکا میتانی یە
میترا ب خومژی نزانیت د زەندوورەک چەوا کووردا ڤەشارتی یە
ئەز چوو ماچێن دیتێ سەربۆرا وان نەبیت
ناکەم گرێکا ژڤانێ رۆژەکا رۆهن
هەپارێ تە خمبابایە و من کووڤی دکەت
دێ خوداڤەند ژ من تۆرە بیت
وەرە ئەز، تو کەڤلۆژانکێن خوە ب سوژین
دا کلەکی د چاڤێ ئاهۆرای وەرینێن بەری کینا خوە دارێژیت
هندی تو گناوەرەک شەڤابی.. توهەر شەڤی

تو پارچەیەک ژ ئەهریمەنی و ژ رۆنیێ درەڤی
ترسا من پلنگەکی بریندارە.. ل تاریێ
چو ژڤان د بەرا من و تەدا نابن، چو سۆزێن سوور ژ هشا من پەیدا نابن
هەر جار من دگۆت پاییز نەهێت
هژیرا مە هێژ ساڤایە دێ راوەستیت ژ وەرارێ
حەز ناکەم بەلگێن وێ زەر بن
ل چاخێ وەریانا بەلگا دبینم دێوێ مرنێ
پەنجێن خوە ل هەستا من دبیتە خوارێ
گولۆپەکێ ب تەنێ هەلگە.. مرن ل تاریێ چەتنە
لێگەڕیان ل دووف ژیانەک هەر دەمی، خەونا مرۆڤاتیێ یە.. خەونە
سوارێن دەریا ب شەڤ هەستێن ئاڤی د خوونن
د ئەرشیفێن گوهاستی دا پەلاتینکا ژ ئەڤری د چینن
د تاریێ دا ئاشۆپا من ژ دوور د رەڤیت
چرایەکی ب تەنێ هەلکە دا درەفشێ خوە بناسم
ئەڤە چەندە ئەز ژ شکەفتا بدوورکەتیم
ستێرکێن چاڤێن من یێن تەنگ بووین
پتر نامینم بێ کریار ل سەر تاریێ
دێ ئاگرێ بەندەمانێ بەردەم دارێ

۲۰۰۲/۲/۱۹

پێشکەشە بۆگابریل گارسیا مارکیز

# عەسمان رێبیا
# گادزایە

پیرەمێرە و ل کوژیێ کوولانێ دروینیت
د ئالۆزترین چاڤگێرکێ را منارە دبیتە گێژەڤانک
لیڤێن مژدارێن مرۆڤان بێ دەرگەڤانک
ئەڤ کوولانە بەندەرێ مەرگێ شەڤێ یە
بەرزەبوونێ دکەتە رۆمانەک زانستی و د ئەفسانا (ئەناهیتا) و
سێزدە سەگێن (ئەخناتۆنی) دگەلکێشیت
شەڤ زەنگلە و بەفر ناهێت/ پشیکەک، ل سەر تەنەکەک گلێشی
دبیتە پێشوی/ مەزن دبیت وەک گامێشی
پرتێن رەوانێن هەلوەریای د ئالیسیت
ئەڤ تەنەکە ماکناتیزە و ژ چاڤێن تە
دەنگ و باسێن برسێ دکێشیت
ل بەر شاشەکا کومپیوتەرێ توی نیڤ مری

دخەونێن تەدا حەیرانا مرنا ڤی چەرخی دهێتە گۆتن
ژ نشکان ڤە دەستێ تە ژ بەرویکا ساکوی دبەزیت
ئەز باوەر دکەم بیرهاتنەک دبیتە دوپشک
سەرێ تبلێن تە دگەزیت
باژێرە و هەر تشت تێ گۆتن تەنێ دلۆڤانی نەبیت
دروناهیێ دا بەرزە بوونە پەریشانی
تە دیتنا خوە ل سەر دیوارێ خوارنگەهێ رویت دزانی
ئەو هەردو چاڤێن هە یێن کز
د ترسا ناڤ دووکێلێ را د ئالزن، دبن قورمز
پیرەمێری و هەر تشت ل سەر تە دهێنە گۆتن
تەنێ پەشێمانی تێ نەبیت
ئەسمان لەفتکا مامزایە و ..؟
بەرەزیڤکێن ژیێ خوە تێکهەل ددەی ئێک
ئەها نۆکە تە دڤێت کەلۆکەکا مەزن پێ ب نژنی
لێ هەرفتێ د باژێراندا ئاسۆیەکا بێ سنۆرە و
لەو رێلستانا سەربوورێن خوە شەپرزە، د پەژنی
ئەڤ ڕۆبارێ مرۆڤ نزانیت ژ کیرێ دەست پێ دکەت
یان قۆناغەک بێ نیشانە و ئافراندنەک هەمی ئاشووپ لێ هندا دبیت
هەر ئەو کەسێ سەربۆرا خوە بشافتی یە ئاڤا دەریای
پێناسا خوە دابوو کومتەکی چیای
ژ بیرڤەکە هەرچی خەونا تە ڤەڕۆتی

ئەو کچکا هە هەکو پیردبیت
هەمی جوانی دێ بیت گولۆپەکا سۆتی
کاوەرە تو.. ئەڤە تە دگوت:
ل من نەگرە د ڤێ گێژەڤانکا مرنێ دا یێ سەرخوەشی
ل من نەگرە/ برس نە شەرمە/بۆتە سەوکەک گەرم بکرم
(دێ هەفت خێرێن خوە فرۆشی؟)
هندابوونە، ئو بازێرە، هەر تشت رەوایە
ل پەرێسگەها شەڤچراغا دیرۆکێ دا دهاتە گۆتن
(هەتا ب سەر لێڤا گۆری یا سودبەخشە پەشێمانی)
-:هێ خەلکینو متایێ من بەر بازارە و خێر ب نانی/
خێر ب نانی
خەم بۆ کورێ کەزیزەرێ، دا لوچ ببیت شارستانی
نە.. پیرەمێر! ئەسمان رێیا کادزایە و ...
بەلێ ژ مژێ ژیان دزێت/ ژ تەمارێ ڤیان دزێت
ل سەر تەختەبەندا دلێ تە وەک کۆمارێ
دادوەرێ یاسایێ مژێ دبیت هارمۆنێن رەوان کوژ
دناڤ رەهێن بەلگێن دارێ را ملیۆن هێلێن وێران دبن
د شابسکێن ئێڤارێ را ئەو کچکا هەی پرچ کارەبا
ب هەردو مەکێن وەکی چەرخ و لەولەبا
بەکتیری یا بێ هەتک د بەخشیت
بۆ ناڤ هەستا هەمی حەیرانڤانێن پاکژ

-: ئەسمان خەونا بێ ئومێدە...
تو ژ راستیێ خوە ڤەدشێری
تو نە شێری/ ئەو نمونێ تو نکاری ژ خوەرا چێکەی
ئەو ڤیانا تو نزانی سنوورێ وێ و بێ ترس ژ خوەرا ناڤی لێبکەی
ئالیەکێ وێ پەرێسگەهە
ئالیەکێ دی ب خوە دوژەهە
شەڤەنگا خەونەکا شینە/ ل شیناتیێ
دناڤ کولوزکێ پیرهەڤیێ را تو نەوێری
-:مە چ دڤێت؟
ئەڤ پسیارە مشە جارا دمژلانکێن تەرا دهێتن، ..
دبیت ڤونێری
هێشتا بازێرێ مە خەونەک کەزوانی یە
کوولانە و رێزکا مێرویا ل بن هەتاڤا گولوپێن رویت
لڤێن بەرزە د وژدانا مروڤاندا دئازرن،
نێرامێ دبن، دا بەرزە بوون ژ دای ب بیت
ئەسمان خەونا نێرگزایە و ...
ترسەک یا هەی، .. چاڤەک ژ تە وێدەیە
ل خوە نە زڤرە،.. دەستەکی تە د رێدەیە
هەما راست بێژە پیرەمێر،
گەر دێ خەونێن خوە تازی کەی/ مرن دبن بەفرێدەیە
نە گولوپێن هەمی رەنگێن دەپێ (بالێ)

نه تیاترو، نه شەڤبێرێن هەمی ڕەنگێن ژ هایچوونێ
نه ئازرینێن خوەشیدەر و پرچا کچکەک سەماکەر و
نه سەرهرینا کێکێن بوونێ
-:تە دڤێتن ئەم ژ تەرا چیا بارکەین
ئها نۆکه ژ ئەوێ دۆژەها تو تێدا
سپێدەکا گەش ل جوخینەک گەنمی سوارکەین
لێ بیرهاتنێن تە ڕێڤنگن، ل کۆمارا ئاکنجی بوونا ئارامێ
ژ کەسکە سۆرێ هەوری و تاڤێ کەر و پرتێن کەسەرێن تە یاخی دبن
د کونشکێن بەهاران دا د خەندقێن خوناڤێ
فلم ژ نڤشێ دەرهێنەری/ دچیت کاکلکا کومپیوتەری
دزڤریتە خەونێن شارستانیا ئەڤرۆ
ژ پاشڤەماییێن (زەید) و (عەمرۆ) وەرناگەرێتن سلاڤێ
ئەسمان ڕێیا کادزایە..
تە بەرزەبوون ژکو ئانی؟
ل ژڤانا بەرزەبوونێ کامرەوایی بۆ دینایە
ئاڤ دگەهێن بای دا هەیە/ نێرینێن من، نێرینێن تە د ئاڤسن
پێنگاڤێن تە ژ ناڤ ڕێلستانا هەبوونێ، ژ خوداڤەندێن مرۆڤ دترسن
-: ئەز نزانم ئەز ب ناڤێ ئەڤرۆکە بانگی تە بکەم؟
یان د پرچا ئەلندێ ڕا ب ئەڤشەڤە؟
یان دکونێن ئەسمانی ڕا ب چیرۆکا مەیا سوبە؟
د ناڤ سترانا خەونێن تەدا ئاڤردانا ردینایە

(وەلو تەو دونایێ/ تەو کۆرێێ
بەلێ تەمۆ لاۆ مرن خوەشترە ژ هەژارێێ)
سەربۆرا تە چەندا سەیرە
سیمەرخ د هێسکێن ترسێ دا تەڤنێ قوربانیێ درێسن
هۆ/ خەونا تە خویساری یە/ باوەر بکە،
ئەز پشتا ناڤەرۆکێن خەونا دخوونم/
ل شارێ تە برێن خەونێن سۆتی دبینم
لێ رۆناهی دەڤ ژ دەلنگێن من بەرنادەت/
هەستپێکرنا من تاری یە
ل سەر کنفکێن تەرازوویێ (پێرۆ) دبن پەروانێن گێژ
(تەرمێ نەحێ باڤێ نەحێ و نوح ل پشتێ..)
بۆ سەرگونکرنا ئێڤارا ئەسمانێ رووس
بۆ کورتکرنا رۆژهەژمێرا ڤی باژێری و
برسیکرنا پیرەمێری ب هەڤکاری یە
ل سەر بانێ ئارەزویا من درویێن
تەنێ پەسارێ بەهشتێ ل پێشیا تەیە
تو سترانێن کورت دبێژی، دوورترین ژ هەستێن کەڤۆکا؟
تو سەوکێن گەرم د هاڤێژی بەر زارۆکا؟
لێ خەونا تە ژ نەهشیا تە و هشیاریا تە

**١٦/١١/١٩٩٦ دهۆک/کاروان**

دگەهم، ئەز یێ دگەهم/ بازێڕەکە و تەژی مرۆڤ
سەروچاڤێن من یێن بووینە نیگارەکێ مەست یێ ترسی
چووچکە سەر مەستێن بەهارێ
نەوێرن هێلینێن خوە لێ چێکەن
ئەڤ بازێڕە دبن سیبەرا عەڤرەکێ ڤە یێ بوویە شکەفت
دلاندکا بەردڕیایدا نەنهابوونێ ئەز یێ پێچایم
د سەرێ من دا ڕۆبارەک و ئاشەک ئاڤێ
ئەو چ مێرن، بوێرن هەڤرانێ خوە لێ کەن
ئەزمانێ من پەیڤێن جوان یێن ژ بیر کرین
چاڤێن من یێن دپاسێ دا بووینە نەشتەر
خوڕ دیمەنا ڕەش دکەن و پاشی ل شەڤێ دکەن
ئەز نزانم نە شەڤ ئەڤرۆ باگیرەکە و خەم ل سەر پشتێ
ئەڤژی بوویە مژخەلەک و بتنێ دیمێن پەنابەرا ل سەر دمینن

چ بێداده، وەکی سەر بێ ئارمانج دگەڕن
وەکی دل بێ ئەنجام دمینن
چ بێداده، ل چاخێ گول جوانیا خوه هندا دکەن
هەکو شاعر ژ پەیڤێن خوه تۆڕە دبن
هەلبەستێن جوان جوان د دڕینن
نۆکە شەڤە پاسێ چاڤێن من یێن هێلاین
ئۆ ژۆرا من ئەوا ل بێ دەنگیێ فێربووی
ئەز یێ دناڤ سترانا خوەیا ئاشۆپی دا بەرباکریم
د سەرێ من دا بازێڕەکە و چەند هەڤالن!
د سەرێ من دا ژنکەکە و چەند زارۆکن، چەند هەلالن!
د سەرێ من دا وەلاتەکە و گەلەک سالن!
گەلو؟ کوشتن هۆسا تەنها چ رامانەک دی دبەخشیت؟
چ مایە ئەز ژێ بترسم؟ ژ تەنها بوونێ دڕندەتر
کاسێتا من کو خلاس دبیت بۆ دجنقم؟
بلا ئەڤ کاسێتە بەس بیت، وەدیارە یا کەڤن بووی
لێ بێ کاسێت ئاشۆپا من دبیتە گورگ و من دئێشینیت
تەنها بوونە و تەنها بوونێ مژلانکێن من یێن بارکرین
تیشکە هرچێن خەریبیێ خور هەستێن من یێن هارکرین
من چو ژ ڤان دگەل دەرگەهی نینن
من چو ژ ڤان دگەل پەنجەرێ نینن

بلا هەمان دگرتی بن

چونکی نه جیرانەک بدەنگێ زەنگێ ئاشوویا من
دکەتە هەلم و ڤەدرەڤینیت
نە زارۆکەک ژ نشکانڤە
دهێت پەرەک من د قورمچینیت
ئەگەر ئاشۆپ رێ بدەنە من
دێ بارێ مژلانکێن خوە دانم
دێ هەلبەستا خوە نڤێسم
ل سەر چیایێ بەندەمانێ یا ل هیڤیا من
بیرهاتنەک یا بوویە ژین، یا تەنهایە
ئێڤارەک و جارەک دی هاتە بیرا من
وێ ئێڤارێ قەلەمێ من هشک بوو، و..
ل سەر چیایێ بەندەمانێ ب تەنێ تیپەک نە نڤێسی
ڤێ ئێڤارێ قەلەمێ من یێ بووی تەشی و ..
دبن بارێ ژڤانا ڤە پەیڤێن پێڤە بووینە ریسی
لێ دیسانێ ژۆرا من هەریا ب تەنێ یە و
ئاشۆپان ل سەر ملێن من دیوارێن دانایین
چاڤەرێیا دەرگەهی ژی نەشێم بکەم
نارینا من، ئەو چووچکا ژ سەر هێلینا خوە نە فری
چوجا بتەنها ناهێت لیسی
بەندەمانا من، پەیڤێن بۆ ئاڤاکرنا وێنە یا
سمفۆنییا بایێ چیاییێن بلندە

د سپێدەیێن بەهاری دا بخوە (مێتۆسە)[1]
لێ دیسانی نەشێم چاڤێ خوە پربکەم
دوور ڤێ بیرۆکا ئەنتیکە خورپ پەیڤێن من یێن ئالزین
ئەڤ بیژیا هزرا من بوو ژ دایک نەبووی
هەرما ل سەر پشتا مەریخێ و بۆ (ئارگۆسە)[2]
ژۆرا من هێشتا یا ل ڤێرە و
دەرگەهێ من مزگەفتە و پەنجەرکا من دێرە
دیوارێ من هزرکرنا (حەلاج)یە قەشەک یێ تێڤە خاچکری
سۆفیەک یێ تێدا دخەلوە چووی
کەڤلێ (مانی)یێ مایە ل سەر دەڤێ کێرا
عەمێ گۆزێ هەردو پێن خوە یێن بەندکرین
کەسەک نەچیت سەر چەپەری
برینا وی خوون ڤاڤێرە

**lubeck,1998/6/10**

---

(۱) (Mythos) ئەفسانە.

(۲) (Argos) گیاندارەک ئەفسانە و سەد چاڤ هەنە.

# كۆمارا پەنجەرێن سەرخوەش

بێ دەنگبن، مرۆڤێن دین پەستا بدەستان دبێژن
شەڤە، و دژۆرا من ڤە تاری ل گوهێن چرای سوار دبیت
تەڤدا هەلبەستێن ب روومەت ژ بۆ سەرخوەشبوونا پەنجەرا
فهێتییێن خوە د هاڤێژن
دبیت ئەز ژی دتاریستانێ ڤە بژیم/ مرن د تاریێ دا نە خوەشە
ئەڤە کەڤالەکە کەرنەڤالا رۆچکاندنا کەڤۆکایە
خوەزی ژۆرا من بێ دیوار با
ئەڤ پەنجەرە نازراندنا دەڤێ تڤەنگ و کێرایە
ژیان د سەرمایا ڤەکری دا بلندترین هەسپێکرنا روومەتێ یە

خەونا سپی ژ من ب گەرهە ئەز نە فێرم
هەمی دەهبە و هەمی قەحبە دبێدادیا ئەلدنێ را
سۆر دبن ژ خوونێ مشت دبن ژ کینێ
دێ کا سەر و بن ب نێرن، تەڤ سەر و بن
من خور خەونێن خوە خوەش دڤێت
من تم خەونێن کەلەش دڤێن
ژین کۆلەکا گوڕۆڤڕە، دهندورێ ژۆرا من ڤە کەتەک ماتێ یە
د دەستێن کوڕێ من دا دبیتە کۆمار
ل فەلەکا رەشا چەرخێ هەرماندنێ هەڕفاندن پەنجەرەیە
زڤراندنا گێژەڤانکێ و هندا بوونا مەژیێ مەیە
رامان د پەنجەرێ را خوە د هاڤێژن بەختێ دەرا
خوەلیا سەرا، هەڤالبەندێ مە دبیتە مار
د باهۆزێن کەسەران دا وێنەیێن هۆڤ،
کەر و پرتێن پەنجەرا ل بەر بای دلەیزن،
ل چپکێن چاما من سوار دبن
سەر ژکینا من یا رەوا هەکو دبارن ب رەنگێ سۆرێ شنگری
خانیکێ مە ل بن ژڤانێن هەڕفتی دبیت ڤایرۆس
ل مێشکێ (ئەتاتورکی) ددەت
لەورا کۆمارا دڕندا د ئەنترنێتا ڤایرۆسی دا
دبیتە ئەندامەک ئەتۆمی و بەرەف پەقینەکا نەدیار

پەنجەرەنە هەمی بڕیارێن ژ نەهشیا من دەردکەڤن
تیرکێن هەتاڤا هسرەتان هێرش دکەن
تاریستانا پەچرویکری ب گوهێن من ڤە/
دەنگ تەڤ کۆلانێن ئارامێ هێرس دکەن
ب ئارهانا بێدەنگیا گوهێن من ڤە
دگەل هۆرەبایێ پەنجەرا دچاڤێن هەوێن پێرۆمەت دا
پێنگاڤەکا هلنگفتی، زینێ ب گورزەک سمبێلا دهێت د بەرمن ڤە
ئەو هەتاڤا ئەم د پەرێسین بارۆڤەیە
نیکروسکێن ئەلندا (بیخۆدی) ب داڤێن پۆرا پیرهەڤیا گرێددەت
د شکەفتەکا (میتانیان) ڤە هەرچی خەونەک مرنێ هەیە
دپارێوزێن (کرێتی) دا ب رێدکەتە بەریا سینا
دا ل (ئەرینا زەردەشتی) کەن نەمینیت
تا ل مالباتێن (خالتییان) هەر پەیڤەکا دبێژنێ (مەم) کەنی ژێرا ببیت
مەرەم/ دمۆریا رەش را دیارە
د پرۆڤەیێن ڤی چەرخی دا ب تەنێ کوشتن نە بڤەیە
د تورا تەنگا پەنجەرێ را ئەز تاریێ دبینم
دشووشەبەندا دەڤەرێ را ئاسوو گەلەک زراف دبیت
د پاشپانییێن لنگێن من دا ئازراندنا ئایەتێن رژ
ئافراندنا وێنێن رەڤۆک د گەشبوونا پەنجێن من دا
خوون د ڕۆباران دا دکەلیت

دو بهۆستا ل بەر پەنجەرێ،
دناڤ کورکی (شاعران) دا دبیتە مژ
دناڤ تیپێن من یێن هار دا خوە ددەن ئێک
وێنەک هەلبەستێ ئاڤا دکەن ژ کومێ (حەجاجی) ورهێن گژ
ئەڤ ناڤەرۆکێن پاییزی بوونە خەزام و ...
تبلێن من پەلاتینکن، یاریا ب مرنا خوە دکەن
ل بەر پەنجەرێ دهێنە کوشتن
ل پشت پەنجەرێ دبنە بکوژ

١٩٩٦/١٠/١٣
دهۆک/رامان

هەر بێهنەکێ رەنگێ وێ دهێتە گوهارتن
پرچ زەرەکە، ل بەرامبەر من هەتاڤێ دخوت
وەک تە لێ دهێت، دزڤڕیتەڤە، پەلیتکێن ئاگری ڤە دخوت
ل سەر تەنشتێ دبیتە تیرۆژکەک لێزەرێ و
رادبیتەڤە نەخشێ کەڤنارێ ل مێزەرێ
شەمەندەفر دچیت، ل سەر پرچێن عەڤرا
تو جارەکێ خاتوونۆکی و جارەکا دی پیرهەڤوکی
من دڤێت ئەز ڤێ دوکەسیا تە بکوژم بکەڤرا
پرچا کاژێ هەتاڤزەرکە و بەلگێن دارا یێن دوەرهن
تەنێ رەشکا چاڤێن تە بوو دیوارێ بەختێ من هونی
هەکو تەرمێ پاشەرۆژا من گرێل دبیت
خور خودان خێر ژێ دگەرهن
ل دووراتیا بەزا هەفت سالێن تیرۆژکی

تو ژ من دوور بای، ئەز نە ژ بەر تە بەزیە
چونکی دەنگێ تە ژ خوەشیێ من دهەژینیت
لەورا دچەنتکێ شڤانەکی تەیێ کورد دا یێ بوویم چەنی
ئەز دزانم نۆکە ل جەرگێ وەلاتی شەرێ شویە
لەورا ژ سەر پەشیکێن خەونەکا مەست
ئەز د پارچێن هەبوونێ دای بوهژیە
هانۆکە ژی من دگەل تە ڤیانەکە
ل ناڤبەرا مە بتەنێ ئەسمان و شەڤەکە
بەلێ تە ئەز د وێرانبوونا خوەدا چاندم
دگەرمە چاڤێن ترسێ دا ژ تەڕاتیا خەونێن بنەفشا رەڤاندم
شەڤباش! قوناغا ئەز لێ میر
شەڤباش! هەڤالێن ئەز ژێ دویر
هەلاتنا نفشێ باڤێ گشت درەوە
هەلگرتنا تیێ تاڤێ بتەنێ خەوە
بالاڤێ بکە، دۆستا من یا ژ هەمیان چێتر
من ژ هەمی تشتان ڤاڤێرە
د سەحکرنا سەر و چاڤێن مشەختان را
مە هەتاف نینە و رۆژ مژە
یارا من، نە باوەری بتە دهێت کرن..
نە دروشمێن مە ل وەلاتی سەخمەراتی
تەچێدکرن، دهێن ناڤکرن

چونکی شەڤ ل نک مە دپیرۆزن
هەر رۆژ مێڤانا ئاشتیێ ل نک مە کێرە
هەر تشتێ رەش دنەینکا دیتنا مەدا دخورستینە
ئەڤ رەنگە ماچکرنا خەونا ئەفسانەیە
ل چاخێ هەبوونا سیمەرخی پەیدا ببوو
پیرا من گۆت: هەکو هێشتا تویێ بچووک
پیرهەڤوکێ ماچەک ل رۆیێ تە دابوو
بەری تە بۆ خوە بدزیتن تو ژ بیرکری
لەورا ئەگەر تو مەزن بووی
چو نفشێن دی نەشێن تازە ل تە ب نێرن
دێ لەشێ وان خور بیت دڕی
ئەڤرۆکە ژی وێ دیتنا هەی رەنگێ چاڤێن وێ ئەسمانی
وێ ئەزمانێ ڤان رەنگێن تاری نەدزانی
لەورا ب تەنێ دکەرێێن خوەدا
من دیت ئەوێ سەرێ من یێ بڕی
جارەکا دی داڤەگەڕین بلا سەرێ من یێ وەسابیت
ئەز حەز دکەم تە ژبیر بکەم
ئو هەردو لێڤێن تە بکەمە پەل
دا بێهنا سۆراڤێ ژێ بهێت
ل مشەختبوونێ کەڤۆکێن تە بکەمە مۆخەل
دا هەتاڤا ژ ئەسمانی دزێت، بەرەف تە بهێت

گەر ئەڤرۆکە تو بخوە ببای پاسەپۆرتەک
بەلێ سەربەست، ژ کونترۆلا نە ترسیابای
خۆڕ پەنابەر داڤەگەڕهێن ناڤ پاخلێن تە
من چو تشتەک کرێت نەدما لڤێ گەردوونێ
گەر تو نوکە هەمی خوون و برین نەبای
گەر بهێلن دێ بروندکا تە شووم ژ ڕەشاتیا کلی
لێ مەهبۆرێن تە هەر دەمن، دفنا تەیا ڤەڕەشیایە و
ڤۆلکانێن تە هەمی چاخا د پەڤن ژ دلی
دلبەرا من گوهێن تە یێن بووینە ئەلبۆم
ل کێلەکا مرۆڤێ هەی ڕۆژهەلاتی
تەژی چاڤێن وی باروێن
دناڤ مرنا هەستیان دا یێ بوویە کوم
پسیارەکێ خوە ژ من دزی چوو دلێ وی،
دیت کو تەڤدا کەسەر ل نکن
لدووراتیا من گوهـ ل دەنگێ وان هەیە زەلامەک و دو ژنکن
شەمەندەفرێ دارستانێن سرێ دبڕیت
هەر ئومێدا د ئەڤێ گەشتا نامۆیێ دا دلڤەدگەڕیت
ب ئازراندنا خوە کوشتنێ دهەڤڕکن
هەبوونا من هەمی بکینێ دهێتە دخواندن
جیهانا من پەنابەرێن ژ خوونێ نەبن نا وەرگریت
ئەو گوهێن هە دهێتفۆنێ دا یێن مسمت بووین

دا چو دەنگێن بیانیا پەردەیێن وان حێرج نەکەن
ئەز یێ دبینم سیتاڤکا تە ل بەر پەنجەرا من دفڕیت
گەر ئەڤە خەونا من بیتن ئەز حەژتە دکەم
گەر ئەڤە هاتنا تەبیتن نۆکە لێڤێن تەیێن هنگڤین
ل ناڤ جیهانا من یا بەفرێ سۆرێ واناى پیڤازی یە
تو بەهاربای دا لێڤێن من کولیلکێن تە کەنە هەتاڤ
تو ئێڤاربای دا چاڤێن من ل سەر کەزیێن تە بریڤە چن
تو ل ڤێ گەردێ بەفرا سارباى دا ئەسمانێ من ئازریت
هەمی عەڤرا د ئاڤێداکریت
هەمی بێهنێن رەندیا گولا دا هێنە خوار
هەکو کەڤیێن تە د حەلیان
بەهشتا ئاهۆرامەزداى دا ئاڤریت
من خوە ژ بیر کر، هزر نەکەی من تو نەڤێی
ئەگەر رێیا تەیا دوورە، ژ شوونوارێن من بپرسە گەر تو نەشێی
ئەز هزردکەم ئەو کچکا هەی ل بەرامبەر من یا روو گەشە
جار ئاڤرێن دۆستانییێ ل من ڤەدگێڕیت
نە پرچا وێ رەشە ئەز ب تە ب شپینم
نە پرچا وێ زەرە کو ئەز هەتاڤا سپێدە و ئێڤارێن تە ببینم
گەر جاروبار دنێریتە من ترس دهێنە من
پرس دهێتە من، نە ب باوەرم تە ب خاپینم

**١٩٩٧/١٢/١٠ ئەلمانیا/ هایلبرونێن**

بلا دوهی من دەست پێکرنا و ئەڤرۆکە دووماهیک پێ هاتبا
بلا گاڤێن من ژ دیتنا تە مشەخت نەبیان
چاخێ پیڤانا رێکێ نەڤیان
ل بەر دەرگەهی چو دیتنێن نەراست راوەستێ
بلا گوهێن من ژ دەنگا نە ترسیابان
من حەز دکر تە گۆتبا: کێ دەنگ ل سپێدەیان
ژ ئاوازێن بلبلا ڤەگوهاستێ
هزرا من ژ هندەک گوتنان باوەر دکر، (نە بینە و نە رەوە)
ئەڤ گۆتنە.. نە.. دراست نەبوون
سەگ بەرزەبوو، بەرزەبوو.. هەر ئەو بخوەبوو
سەگ ل کیرێ بیت دێ گوهلێ بیت

ئەگەر گوهێت وی داگرن دێ هەست پێ کەت
ئانکو یا راست مرن تەنێ چارەیەکا ئێکانە یە
بۆچی مرن؟ ژ بەرچێ مرن؟ گەلۆ ئارمانج ژ مرنێ چ بیت؟
من نەڤێت چو بەرسڤان بدەم
سەر هاتیێن سیمەرخ تێدا کی بەرسڤاوان وەردگریت؟
شەڤێ ل بەر دەرگەهێ مالا من، مالا خوە دانا یە و
پالا خوە دایە دیوارێ شەڤەکا مەزن و بێدەنگ
رۆژەک بێ تاڤ یا دژۆرا من ڤە
گەلۆ ئەز مالا خوە چما دناسم؟
ئەڤ پسیارە ژی بلا بمینیت بێ رەنگ
من ل بەر بوو چەند دارەکا دژۆرا خوەڤە بچینم ژ بەر رۆژێ
ئەڤ کارە ب هەڤالێ من تشتەکی سەیر بوو
ئەوێ ئەز و ئەو ل دەرێ خواندنگەهێ دگەهشتن ئێک
ئەز و ئەو باش د ئەزمانێ ئێک دو ناگەهین
ئەز خوە نیشا وی نادەم
ئەوژی دمژا گومانێ دا خوە ڤەدشێریت
من حەزنەدکر ئەو چو بەرسڤا بدەتە من
ئەو وەکی من ل شەڤ و رۆژا نانێریت
ل نک وی ئەگرنگە شەڤ هەتاڤ بیت و رۆژ تاری
مرۆڤ ب رۆژێ بنڤیت و ب شەڤێ مەی ڤەخوت
دار ژی هشک بیت، ب بەربیت، بێ بەربیت

یان ژی هەما ل سەر دیواری سیبەربیت
ژیانێ دباوەریا وی دا چو ناڤەرۆک نینن
بەلێ ئەز برەنگەکێ دی ل هەمی تشتەکی دنێرم
هەتا کەنیا هەڤالێ من ژی یا بۆ من بوویە جهێ گومانێ
جار هزر دکەم ئەو د هەمی تشتەکی دگەهیت
فەیلەسۆفەک یێ دکەسێ وی دا
ئەڤ دو پارچە بوونا مرۆڤی یا بۆ من بوویە سەهم
براستی ژی کەساتیا مرۆڤێ دین بۆ من نهێنە
ئەز گەلەک جارا حەز دکەم د کەساتیا وان بگەهم
نۆکە ئەز هزردکەم ئەو زەلامێ دپاخلا مندا
هندە هندی نە ئاریایی، پاشی دێ بیتە دڕندە
دڕندە ژی ب ساناهی ناهێنە گرتن، گەلەک یێ نەرم بووی
ئەڤ رەنگە ئارامبوونە نێزیکە دێ هەستێن من ئازرینیت
وەدیارە ئەز یێ بێزار بوویم ژ لێگەڕیانا خوە
من نەڤێت خوە د لاوازیێ دا ببینیم
ئەڤ کەسە ژی ژ من ناهێتە ڤاڤارتن

**٤/١٠/٢٠٠٠ لوبێک ئەلمانیا**

نەچە و پچەک دەف من بە
ئەز حەز چووچکێن کەهی دکەم
هەمی هزرێن من کەڤۆکن و هژمارتنا تەرما نەڤێن
تبلێن من پەلاتینکن، دگەل ڤەبوونا گولا د زێن
شیرێ کەنی یێ دسینگێ من دا هلا نەکەڤیت داڤێن گریا نەرەند
ئەز حەزکرنێن ئەسمانێ سپی د ناڤ جوانیا هەژنا کەنیا تە دا د بینم
هەکو پەشکێن کەنیا من و لێمشتێن کەنیا تەیا تەر
داڤێن هەلاتنا رۆژێ وەک دو سۆفییێن زەرەدەشتی همبێز دکەن
هەمی جیهان بۆ پشتگریا کینێ و کەنی د بیتە دو بەند
سەما یا مرنا کەڤۆکا و بریانا دەنگێ پۆڕایە
دیسا جەنگە و مشەخت بوونا سنۆرایە
داڤێن خوونێ ل سەر پشتا من برینێن دەربەردای چێ دکەن
برینا شیرێ زارۆکا و ڤەشارتنا سەربۆرایە
ئەز کۆسۆڤۆم، تو کوردستان، ئەز کەشمیرم، تو ئەڤگانستان

ئەز باسکیمە و تو زەنگستان
بازرگانی ب خوونا مە پەترۆلا ناڤ پاپۆرایە
تو گرتنا بێ دەست و پێی، ئەز تەرمێ کوشتنا هەلبەستان
سنۆرێ من پشتا خەتا سیه و شەشە
دبن خەتێ دا برین و خوون گیانێ من
دگەل پێلێن بایێ ئارارات
ب سووچکرنا هەمی کوردستان پەرستان
تو ئەلبانی، تەرمێن دەستێ میلۆسۆڤیچ
لێ دیسان ژی ژینێ د خوازی و رزگار بوونا ژ بن دەستان

٢٤/٤/١٩٩٩ ئەلمانیا

# نەھ چرکەیێن گولاڤی

فالڤەکەر بوو دناڤ برمیتا پیرا من دا دبێهنژی
ئو دگوت من: ئەوا دلێ تە برەڤیتن گناوەرە
چوجار لێڤێن وێ ماچ نەکەی دێ خوە کوژی
دێ نەھ سالا بیتە دووکێل د خودیکا سیبەرێ را
ئەو نە هینە، دێ ڤەگەریت د گەردەنا هەتاڤێ دا
ئەز بوومە تۆرا پسیارا و...
ژ خالێن دەستکرد باوەری ب پسیارا نەبوو
پاشی کەزیبیا وێ بوو مار و خالەک ل ئەرزنکا وێ خوار
لێ پرچا وێ بەلاڤەبوو هەتا دێمێ وێ خورێ ڤەخوار

ئو پڕ کەنی، من هزرکر ئەسمان ژ لێڤێن وێ هاتە خوار
گوت: نە ترسە ئەڤە سێرکا بەختێ تەیە
وەسا د مۆرێ را دیارە ئەفسانە یە و..
ئەڤە خەونا قەرەچێ بوو و ..
ل مەهبویرانێن سەرێ هەیڤا ئاڤس نەبوو
ئەڤا نۆکە ل بەر پەیکەرێ مەم و زینا ل من دنێریت
هەر ب تەنێ ئافراندنەک چامانەیە
سال بۆرین و تو نەهاتی
وەک تو هاتی و سال د بوهژین
دلەرزینەکا هەستپێکەر دا
نەهـ وەرزێن کەسک بوونە شویژن
نە من زانی چ ئاشۆپ بووی
داڤێن رەڤاندنا مۆرێ تە ڤەدکوژن
ئەڤ سەرابە سۆزا (مەلێ) جزیری یە
یان ڤەدانا دەنگێ منە و مزگینیا خوەشکا میری یە
نە تە دزانی ئەڤ چامە بێژ دێوانە یە
ل بەر پەیکەری، دەنگێن جوان، رەنگێن سڤک
ئەزمانێ ئاڤرا چێ دکەن
گەش دبییەڤە دزهێن چاڤێن ئاڤران دا.. رەند
ل پێشانگەها سەروچاڤێن دێرزەمانێ ڤەبووی گووڤەند
نەهـ چرکەیێن ب گرنژین بوون سیمایێ دیتنەک مەند

هێ ئەوا کو ئەز ناسدکەم چیکێن کەنی دبای دوەرینی
د مەستبوونا بەهشتێ دا پەسنێن شەمێ ئەز هێرکرم
تو یا ئازاد ئافرانکاری و ل تە دچڤم
ئاسوو هەلبەستەکا زەرە و لەو دنڤم
ل ناڤ دەستمالا خێڤزانکێ بلبل ئێک و دو ماچی دکەن
قەرەچێ دگۆت: ژ بۆ کو فالا من راست بیت
هەر تشتەکی ل تە بەرزە بووی دێ بینی ڤە و
ل بەرامبەری دلبەرا خوە دێ بییە پەند
تشتێ ب ترس دڤێ خودیکا سیبەرێ دا ب تەنێ ماچن
کچا پەرمویچکێن ئاگری، ژ بارانا ترش ب ترس باری
هەستا من زا و تو تێدا بووی
ل هەر چاخەکی ئەز و تو دبووینە کوکوختی پەیڤ ب چوونا چن
نۆکە ئەز بیر ل گەشتەکا نامۆیی دکەم
لێ ئەز دزانم ئەڤ رۆژێن هە ژ باندوورا من دەرناچن
ئەو کەڤالێ کۆچکا میری چاما من بوو
خێڤزانکەک تێدا ژییا، رەنگ خانم بوو
تو و گرنژین د مژیلانکێن بنەفشی را پێکڤە شین بوون
د بەر تەنشتا دلێ من را بوون خوداڤەند
دگەل خاپێن فالڤەکەرا هەستپێکرن دبیتە ئەزمانێ نێگزا
پەیکەرێ تە و پارچێن کەڤالی سحری و هەمی کولیلکێن نێراندی
ل ملێن (گودو)ی ژڤانەکا بێ هیڤینە و دبن بازبەند

ئەز دێوانە و تو ئەینکا بەرامبەری
ئەز ئەفسانە و تو ئەسکا (زاراتوشتەری)
هێ ئەوا تو ل خوە د پرسی ستران ژ تە را
ناڤەک تە هەیە گەر ئەز بزانم
ناڤەک تو نەیە گەر ئەز نوزانم
ڤەرێژا ناڤا ترسەکە و ژ مژا دێرینیا کەلێ
بەندەمانا مە هاڤی یە
تو ڕک و ڕک ل بەزا چاڤێن من نە نێڕە
ل بەر چاڤێن تە چاڤ بەندەرن
وێهەنێ ئەز دچاڤێن تە دا بوویمە یاریکەرەک رۆکی
ل سەر پەنجێن شادیا کەسک تەڤ سالێن دووریێ دپیڤم
ل هەر چرکەکا دگەهینە ئێک دبێ پارچەکا خەمرەڤی و
ل خەمرەڤینان هن هەڤۆکێن بێ ناڤ دزێن
دگەل هەلبەستا درەڤن کووراتیا کیشوەرا
وەسا گۆت بوو مۆریا دەقدای: تبلێن یارا خوە نەگرە
سیپەلا تێشکێن هەتاڤێ دێ پەنگیتن
ل چاڤێ یارا خوە نە نێڕە/ تەڤ جیهانا ئەهریمەنی دێ لەرزیتن
مە ژڤانا (گۆدۆی) بڕی.. مە چیرۆکا گۆتۆی دوری
هێشتا ل سەر ئەینۆکێن پەسارگەهێ سۆسنەکی
د مژیلانکێن کەڤیێ هەلدای
بێهنا تەیا ل ڤەشارگەهێن هۆلەک مەزن بەلاڤبووی

لنگێن ناڤەرۆکا خوارن/ ژ پشتا برهێن مە دبارن
ل نێک چرکەیا بێهن سلبووی ژ هەلما ئاخێ
سترانێن مە سنۆر شکێنن/ دەڤێ هەلبەستا دبێنن
دگەل کەڤالێ مۆنالیزا و مرنا چاخی
چاخ فلاشباک ل سەر پەردەکا ئەفسانەیی
(د زڤری یەڤە، تو دهێی، ئەها ل ڤێرێ نەڤ سالا دمەمکێ خوە د
وەرپێچی و
د تبلا تەدا نەڤ چرکەیێن دەمهەژمێرێ)
ل پشتا چاڤێن دیوارێ مەست هەبوون دێو
بێهنێ ژ رەنگێ چیا ددزیت
ب تێهنێ ژ رەنگێ برووسیا درژیت
ب دیتنەکێ ل دوور بەژنا تە د ئالزیت
تو ژ گولاڤان بەرزە تری
ژ سلاڤان نازک تری
تو د ئاسوویا چاما من دا رەندترین ئاڤا دهەلگری

هاڤین/١٩٩٧ دهۆک

# نوتێن سترانا شۆرەشێ

بێژە و نە هێنێن خوە بێروومەت بکە و تبلێن جوە بکرینە
پەیڤێن لەرزوک د چاڤێن تەدا پوشمانن، ب پەژن
ژ فهێتیا لیڤێن تە یێن بووینە بزۆت
سیهـ سال شورەش، سیهـ سال مرن
تو ل سەر پەسارێ ژڤانا ل هیڤیا من بە
سیهـ سال و ئارەزوویێن تە د سەر بڕینە
ئەز دکەڤالێ کۆڤانان دا دێ تە بینم
هەردەما ئەز ل سەر ئەسمانێ تە روینم
پێشەمانی دبیتە ئاڤ و ژ کولۆڤانکا من دوەرێت

دناڤ چریسکێن ئەلندێ را هندەک پەیمانێن گوڕینە
بێژە و گەرماتیا هەر تشتەکی د سینگێ تەدا مایە پەنگیای
بەنکێ سەربۆرا درێژە، سەیرکە دینبوونا ڤی چیای
ژ هەستپێکرنا دەرا دبەزیت
هەر گاڤەکا ئەز ل سەر گویفکێن بیانیا دبمە مێش
پێهاییبوونا من ب سۆفیاتی ژێرا دتەزیت
ناڤەکی سەرەوژێرە ب من ڤە
د بەریانکێن من دا، دبیرهاتنێن من دا بنڤە
تو یێ تەنهای.. د هاڤرێن هاڤیبوونا من دا بنڤە
تڤەنگێن خوە هەلپەسێرە ئەڤێ پەیڤێ پەیڤا من یا کەربێ
سەرێ خوە دانە سەر رستکێن دلۆڤانیێ
مە دڤێت شەرما تە بدەینە بای و
هەر خەمەکا تەهەلگرتی ل پەسارەکی
لەو د بێژن مێرێ شەرمین ب کارەکی و ... فهێت نەکە،
گەرتە ب ڤێت تو خەونەکا خوە ببینی
دێ ل سەر جەلەبکا تڤەنگا خوە یا پیر روینی
ب کزیا چاڤێ ب نێرە دووکێلا جگارێ
بیرکە ل چیرۆکا مگارێ/ هەر تشتەکی بێتە خوارێ
دو بەرەکی، هەلوەشیانا ئەفسەرەکی
د ڤستەڤالا نێڤرۆیی دا خەلاتا بەنکێ قنارێ
ئۆ هەمی سالێن دەربەدەر، ئۆ ئۆمێدێن بووینە بەر

ل ناڤ گەلیێن هندابوونێ ب ئارامی دبن نۆکەر
دکەنە هەوار: ئەڤ دیوارێن پەرێسگەهێ خوڕ بیڤێرن
مامسۆفییێن ریه رێلستان
دئێڤارێن گەماری دا ژ ترسیانا بیرکرنێ خوەڤدشێرن/
کو نەوێرن/ ل سەر سیمایێ ئەڤی چەرخی ببن ئەکتەر
ئەز دزانم سەروەرا خەونا پڕ کرێت، چیچەک دباخان دا نەڤێت
بێژە.. تەڤ کۆڤانێن شەڤێن خوەییێن ژ بیرکرنێ
بێژە..بلا لێڤێن تە ڤەکەڕژن/
ددانێن تە رۆندکێن کەلن/ ژ لێڤێن تە دڕژن
بێژە.. و ئەڤە چەرخا شۆرەشێ یە/
چەلەنگە مێر خوە ب ساخی تێدا دسوژن
دا پاشە رۆژ بگرنژن.

دهۆک ١٩٩٦/٨/٩

# نۆتێن سترانەکا نەستراندی

ئەز ل سەر بانێ سترانێ تە دراموسم
تو ل بن سیڤاندا هەلبەستێ برینداری
ئەز ل ناڤ نۆتێن ژیانێ تە د پەرێسم
تو ل بەر گڤاندا مەبەستێ کەرولالی
ئاوێنەیا ب دیواری ڤە یا مرار بووی
بێدەنگیێ ژۆرا من یا کورەکری
بێهنا تیژا خولیڤانکا جگارێن من و
دگەل بێهنا ژ تەراتیا سەرمایێ دهێت و
خوهدانا تەیا هاڤینی، ییێن تێکهەلبووین
ئەز کرمەکی ئێکانەمە و
ئەڤ کەلەخە بۆ من لیسە
ئەگەر نۆکە ئەز مێڤانێ هەتاڤا ئێڤارەک تەبام
دا دیوارێ بێ ئومێدبوونێ هەرێفم

تو گوستیرکا (سولەیمانی) پەنی بکە
دا ئەفریتێن تە ب بەزن
شووشێن دو تاخێن پەنجەرا من بشکێنن
گولێیا من یا هندا بووی دەڤی ل تاریێ ب بێنن
دەرگەهێ من ژ کلیلدانێ یێ گەهی بووی
نە زارۆکەک پاشڤە دئینیت
نە هەڤالەک وی د فرینیت
پەردەک پیر و خودیکەک رەش ب دیواری ڤە
وێنەیێ من وەکی گوندۆرێ ناڤبەرا د پەرچقینیت
هەچی گاڤا هەتاڤا سپێدێن بازێری دهێت بیرا من
کەلیا شەدا دبیت سێدارە و هەر بیرهاتنەک د حەفکا من دا وەریسە
کچا من یا هێش ناڤێ من ژ بەر نەکری
گەلەک دڤیا پەیڤەک شرین بدەتە من
ل سەرکەنارێن میکرەفونێ و شەپوولا
دەنگێن سنۆر بڕ بۆ من رەوانەدکر گری
رۆندکا من وەرە خوار و ل بەر دیوارێ مشەختییێ نەراوەستە
هەڤالێن من نۆکە پارچێن من خرڤەدکەن
ڤالاهیونا جهێ ئەز لێ ب بیرهاتنێن خوە پرڤەدکەن
ئەز نزانم نە هەڤالێن خوە بچڤینم، نە زارۆکێن خوە ب نەڤینم
نە سپێدەکا کوردستانی ببم سوارێ چەرخێ دین بووی
ل سەر پشتا هەسپەکی بۆز دەستێ تە بگرم ب رەڤینم

ئەز باوەرناکەم، ئەو چرایێن دناڤ من دا هەل، ب تەمرن
پێلێن ئەڤینا من یا پڕ ب پێکێن ڤۆدکایێ ب ڤەمرن
مەگەر بیرهاتنێن بێ چەشنە هەبوونا من سەرڕێ دکەن
ڕەند زەریا داسنیا بازێرێ من
هەر شەڤ جهێ من تەنگ دکەت و ل سەر لێڤا تەختی دنڤم
پشتا نارامیا ژۆرا من تورڕ دکەت
لێ، خەونێن بالیفکی دخوونم، نەهری یە
خالێن دەرگەهی دبینم، خورڕ گری یە
خودیکا پیرا ل دیواری وەکی هەر جار ئەز ژێ دترسم
سەروچاڤێن خوە ب بینم ژ دڕندەیا دڕندە ترن
خانما من هەر چاخەکی رۆبار شێلی
ماسی د رەڤنە کنارا و پەرێن ناڤێ
گرنژینێن سپێدەیێن من هەکو ئومێدا د لیسینێ
پەچرووم دبن دگەل هەتاڤێ
خانما من تو نازداری
هەکو چاڤێن تە شانویا کەنی یێ دگێرن
پەلاتینکەک ل سەر کولیلکەک بنەڤشی
چاڤێن خوە ب رۆژێ کل ددەت
هێشتا جوانی نە هەلوەشیایی
هەر چاخەکی مرۆڤ ژ خوەشتڤی یا خوە دوور
هەر سترانا د سینگێ وی دا یا ژ دفنا کابووسی ڤەرەشیایی

سەربوورا فلمەکی کەڤنە و تاری یە
مرۆڤ د گەل خەما ب رکە و بێزاری یە
ل خور دەور و بەرا ب شکە و د گشت بهاڤان دا نەشیایی
گەر بزانی من چەند پەلاتینک د ڤێن
تو دێ هێی شاد، دارکا من بکەین هێمنی و
دا ڤان دیوارێن دووکێلی و من و تەنها بوونێ و شکێ بکەینە کەنی
باوەر بکە شووشا من یا کۆلانی یێ هەبوونا من یا ژ بیر کری
پێکێ من یێ کۆکا کۆلا تاما خوە یا هندا کری
یان بەری گەهشتنا لێڤێن من زامێن هەست پێکرنێ دئێخیت
ل سەر لێڤێن من د بیتە کاری و مرنا ژ سرا رەش ڤەپەشیایی
خانما من ئەڤ شەڤە ژی تارستانە و بەفرا د باریت
ئەڤ ژۆرا من گۆرستانە و تو خەمێن من نە راموسە
پەیڤێن من مری، رستە د کەنە گری
ئەڤ وارە نە کوردستانە و ب تەنێ ژۆرا من یا رووسە
تو چناری و چنار هەمی بۆ من یارن
تو دلوپەک خوونا ساری و تەڤ کارەسات ل من دبارن
پێن بووینە رووبار پێ پێن من، بەفرێ رۆیێ وان یێ گرتی
ژ کەل ببەزینە تو هەسپێن خوە
چونکی مرۆڤ گەر ژ پاشماییێن هەتاڤێ ڤالا د بیت سرا پیسە.

**١٩٩٨/٢/٣ مێرسی بۆرگ**

ئەز پارچەیەک ژ زاگرۆسی بووم
خەونرۆژکەک ئەفسانەیی ئەز هەلگرتم
دوهی ل رۆما و پیر ل ئەتینا و سوبە ل (پاریس)
ئەڤرۆ ل (بازل) ئایەتەکا چاڤبرسی بووم
هەر تو بخوە بووی خوداڤەندا جوانیا (بازل)
هەر تو بخوە بووی ئەفسانەیا تویتن و ماچێ
ل بن دانگا ئێڤاریەک خەمێ پۆشیم
نیکوتینێ تو خاپاندی و کری خوازوک
ل بەر سینگێ من یێ نامۆ و ..
پاشی د خوازی جگارەکێ
چاڤێن تە ئێسکەنە و ئەز لێ دگەریام

هەكو ل بازل ئەز بەرزە د بووم
من گەلەک تشت پێ د شپاندن
کەرنەڤالا چەنسێ من بوو پاکیتەکا سەرنەشکەستی
لێڤێن تە پەردەنە و
بایێ ڤیانەکا نامۆیی د گرنژاندن
ئەز و تو پێکڤە ل ژڤانا رێکەک دووربووین
ئەز یێ نامۆ و تو یا تەنها
شەڤەک شەنگ و ترینەکا بێگوهۆرین
گەوریا تە گەردەنە و
حەزەکا نیکوتینی مۆرکێن کرکا تە د خوراندن
گلاسێ سێ- بازل- هامبۆرگ
گلاسێ سێ-بازل-هامبۆرگ
گەشتەکا خوەش- شەڤەکا شاد
پێنگاڤێن تە تو راچاندی و
بەرەڤ نک من ڤە دهاتی
قۆناغا تە دگەهینت هامبۆرگ
دووراتیا من ژ داسنی یا دەست پێ دکەت
من دزانی ئێک جگارێ ژ من د خوازی
ب تەنێ کەڤرەک یێ بەرزە بووی
تەژی حەزدکر ئێک جگارە پەیوەندی بیت

ب تەنێ جگارەک و ماچەک
شیانێن گەرم د حەزا من دا د ئارینیت
ل ئەڤێ بانهۆڤا ساروبار
نەکەس لێ یە.. نە کەس ژێیە
نەگەز لێ یە.. نە ئەز ژێ یە
د حەزەکا نامۆیی دا (جێنی) و جوان
پشکێن ڤیانا من یا هەر جار د بوون دڕندە
وەکی دوهی د ئاریان و تو د پەراستی
ل سەر چیای ببوون بەفرەکا هویر
ل شوون حەزەکا هەمیشەیی تو د پاراستی
هەر تو بخوە بووی
چپکێن حەزێ ژێ دبارین و
هوزانەکێ دلۆپ دکرن
تو دناڤدا بلند دبووی
ئەز چیایەک گومانێ بووم
ئەز ترسیایێ هنگامەک بەندەمانێ بووم
تە دناڤ زڤرۆکەک بێ دەنگ دا
ل هەمی لایەکێ چیای د نێری- ل گولێن گەرم
تە چاڤێن خوە د تڤەنگێن نێچیرێ دا
د هنارتنە پێشیا حەزێن من یێن کووڤی

دا ل بناری چیایێ بێ ئارام
نیشانێن نەلڤ ب هنگێڤن
حەزێن من دناڤ چاڤێن تە دا دبنە تەرم
ها ل وی چاخی سەرماوەکی هۆڤەکی دڕ
هێرش د کەتە پارچەیێن رویت
ژ لەشێ تە هەمی تشتەک راوەستیایە
ژ بلی گێژەڤانکا تە یا کێم لڤ ژ بێ دەستی
هەر تو بخوە بووی
دکو زڤرۆکا حەزێن من دا پەریشان بووی
گەر تەڤیا ژ ئەڤان لێمشتا دەرکەڤین
کەڤرەکێ مەزن.. ئو گەلەک ژ بلندی یێ
ب چیایێ حەزێن خوەدا گرێل بکە و
ل دویڤ وەرە خوار..
ل دویڤ کەڤری وەرە دانە وەستی
بیرهاتن مژن.. دێ ڤەرەڤن
زڤرۆک گێژبوونە و گێژبوون هەرفین
ئەز دزانم ئەڤینێ بکەم
ڤیانا من دێ گەلەک  یا کورت بیت
چونکی هەستێن من..
ژ رویدانەکا پڕ و پڕ بترس د خاڤن



ئەز نەشێم ژ بۆ هەر رویدانەکێ بگریم

هەتا تینا من ب داوەشیت

لێ شیانا من ب هێزەکا ئەفسانەیە

ئەز هەست ب خوەشیەکا نهێن دکەم

ل ئەڤێ بەرزە بوونا خوە ب سەربەستی

پەسارگەها من پێکەکا ڤۆدکایێ یە

ئەز و تو وێ دگەل ئێک ڤەخوون

پاشی هەر ئێک ژ مە ل فارگوونەکێ

خوە د خەونەکا خوەش وەرپێچیت

سپێدێ هەر ئێک دێ دوورتر بیت

**پێشکێشە بۆ (Jenny Hartmann)**

# ناڤەروک